# ... ليسا بەرگی دووەمی کتێبی تەریق بوونەوەم

دەق / مەهدی سالْح مەجید
ئۆکتۆبەر - کانوونی دووەم
بەریتانیا - هەڵ ــ ٢٠٠٠

حديث عيشق چە حاجت كە بر زبان آرى
بآب ديدەء خونين نبشتىء صورت حال
(( سعدى شيرازى ))

- ، ليسا هاورێی نزیکی شینایی ئاسمانەو لەگەڕەکی گوڵە زەنبەق دادەنیشێ
ماڵەکەی لە تەنیشت ئێوارانی کەمتەرخەمی منەوەیە .. نزیک ڕۆشنایی ئاو دەکەوێتە قەراغ تینوێتی
لە شەقامی سەوسەنی میهرەبانییەوە گەلێک دوورە هەرگیز پێی ناگەیت
. دەکەوێتە ئەوسەری ئایندەی منەوە
بەرانبەر ئەو کۆڵانەی دوورە پەرێزی تەنیایی من کە تەنها ( با) پیاسەی تێدا دەکات
- : ئاو متمانەی بەڕۆیشتن نەماوە ، ژیان لەو بەردەمەوە ڕەت نابێت پێی دەڵێن
کۆڵانی تەنیایی ژمارە -١٩٧١- .. دوکانێک هەیە ئاسوودەیی بەقاچاغی دەفرۆشێت
پارکێک هەیە جوانی بەنرخێکی گونجاو دەگۆڕێتەوە بەخۆشەویستییەکی ڕووکەش
نازانم ئەو پارکە لە کوێ دائەنیشێ .. هەموو جارێک ژنێک دەرگای ئێوارانم لێ دادەخات
... نازانم شەو لەچ تاریکاییەکدا دەبەمە سەر
دار سنەوبەرێکی حەپەساوم لە سەر شۆستەکانی تەنیایی مەغریباندا دێم و دەچم و لەبەر خۆمەوە-
.. قسان دەکەم کەس هیچم لێ حاڵی نابێ و دەڵێن نەخۆشی نەفسیمە
- تارمایی بێدەنگییەکی ترسناک کە تۆزی تاریکاییەکی ڕەشی ئەنگوستەچاوی لێ هەڵدەستێ
.. حورمەتی بێ دەنگی شەوەکانم دەشکێنێت ، تەنیاییەک لە سوچی مندا دەگری
بەیانیانم زۆر بەشپرزەییەوە هەڵدێ و لەبیری دەچێت خۆرەتاو لەگەڵ خۆیدا بهێنێت
.. خامۆشی دڵی ئەم دەنگییە گەورەییەی ناخم ڕۆشن بکاتەوە
.. ئاو) بەدەم داڵغەوە دەستی بەڕۆیشتن کرد بۆ ئەوەی لەدوورایی خۆی نزیک ببێتەوە)
پایز سترێچی عادەتی گەڵاکانی داکەند بۆ ئەوەی ڕەوشتی مەخمەڵیی ژیان بگۆڕێ ، گیانی تەنیایی
ڕەق و تەقی من کەوتە دەشتەوە .. تێدەگەم چ زمستانێکی سارد لە منەوە دەست پێ دەکات
- من مشتێک چڵ و چێوی گۆشەگیرییەکی کۆنم لە زووەوە لەبەر ئەم سەرمایە دانیشتووم
- ئەگەر کەسێک بەشوێن سۆراخی منا هات ، من لە ماڵا نیم مردووم هەر قسەیەکی هەیە با لەسەر
.. گۆڕەکەم جێی بهێڵێ
- .. ئەوانەی کە لەپشتی مردنەوە قسە دەکەن تەنها لە پشتی مردنەوە لە ژیان تێدەگەن
- کەس گوێ لە گۆرانی سەنگینی دڵئێشاوی (ئاو) ناگرێت دەڕوات لاناکاتەوە

چ شتێک نییە جێی بهێڵێ بۆ یادگاری بێجگە لە کەنارێکی ڕووخاو ، ژیان نازی کەس هەڵناگرێت
ئەگەر کەسێکیش بێت باوەڕ ناکەم تێبگات کە هەمیشە پیاوێک لێراکانەدا کە هەموو گیانی تارمایی
بوو لە پاڵ درەختێکی بەساڵا چوو ، لە پاش چاوەڕوانییەکی ڕیش سپی ، چەندین جار ناوی خۆی
- بە گەورەیی ، بە بچووکی ، بە منالی ، بە پیری لەسەر ئەم توێکڵە دارە هەڵکۆڵیوەو لە خوارەوە بەدەم
گیاندانەوە نووسیویەتی ئاخ لیسا ، لە نێو بۆشایی لاپەڕەکانی جەفای سەد ڕەنگی ژیان تا مردن
-: گریاوەو هیچ قسەیەکی تری بە شیاو نەزانیوە بیکات تەنها ووتویەتی
،... خۆشم دەوێی لیسا -
دەمەو بەیانییەک ژیان کە هێشتان خەوی بەیانی بەری نەداوە بەڕویەکی گرژەوە -
-: بە توندی دەرگاکانی قایمی پێوە دەدات و بە مۆنییەکەوە دەڵێ
ئەم ماڵە کەسیان لە ماڵا نییە باریان کردووە بۆ ئەو دونیا .. ئەم چەمە ووشکی کردووە-
ئیتر لێرەوە ڕەت نابێت .. ئەم دڵە خاڵییە لە ژیان ..ئەم خانووە بێجگە لە بیرەوەری کەسی تێدا ناژی
ئەتۆ پێت وایە کەس لە مەعنای فیزاحی هەڵوەرینی گەڵایەکی سەوز تێبگات -
.. کە چ ئازارێکی کووشندە دەگەیەنێتە عادەتی زامی بەسوێی هەڵوەرین
پەنجەرەیەکی شکاو هاواری چ ئێشێکی سەختی گریانی ووردو خاشبوونی دڵشکاوی لێ دەتکێ -
باڵندەیەکی نەخۆش لەسەر لقی ووشک هەڵاتووی درەختی پایزە ساردەکانی من
بە بێ هیچ مەخسەدێک هەڵکورماوە تەنها ڕۆژ دەباتە سەر ، ئێواران بەڕووییەکی خامۆشەوە
.. دەچێتەوە بۆ نێو کەلاوە کۆنەکانی تاریکی ژیان و شەو بەداڵغەی لیساوە سەر دەنێتەوە
من چ ئێشێکم نییە لێراکەدا ڕاوەستاوم / بە بێ هیچ هۆیەک دەگریم یان -
هەزاران گۆ دەمهێنێتە گریان ، نازانم ژیان گاڵتە نییە بەدەمییەوە پێبکەنیت ،
تەنها دەمەوێت تەماشای ئەو سودفەیە بکەم کە پرشنگی خشڵی جوانی لیسای لێ دەڕوێ و
بڵێم ئەی مانگ تۆ چ ڕێکەوتێکی جوانیت و لە پەنجەرەی منەوە هەڵنایەیت ، ئیتر تەواو
من حەز ناکەم کەس لای هیچ گلەییەک باسم بکات و بڵێت ئەو سێبەرەی ئێواران لێراکەوە دائەکشا
هەموو گیانی تەنیایی بوو ، ئەو کاتەی کە ڕۆژ سەری داخستە خوارو مانگ سەرپۆشی ئێوارەی بەست
لە تاریکی مردندا ئاوابوو / هیچ یەکێک لەڕۆژەکانی حەفتە لەدڵی خۆیاندا نەیان دەگووت
ئەم ئاوەمان بە ناحەق لێڵ کرد، ئێمە لەم تەنیاییەدا عەزیەتی تۆمان زۆردا بمانبەخشە لە -
بێدەنگی / گەردنی ئەم دڵرەقییە ئازاکە .. من بەتەمای ئەوە نیم ڕۆژێکی خۆشی پێنج شەمە
داوای لێ بووردنم لێبکات و بڵێت من لە ژیانی تۆدا زۆر درێغ بووم .. بەڵام پێم خۆشە
.. چوار شەمەیەک بڵێت خۆشم دەوێی تۆ لە تەنیایی جوانتریت
لەسەر دیوارە سپییەکانی دڵم بەخەتی گەورە گەورە نووسیومە لیسا هەر کەسێک بیخوێنێتەوە -
.. لەوانەیە تێبگات من بە چ نەخۆشییەکی کوشندە مردووم
ئاو) لە ڕاوەستاندا پێویستی بە دڵنەوایی کردن هەیە .. گوڵ کە ڕەونەقی جوانییەکەی دەمرێ ) -
پێویستە پێی بڵێی خۆت خۆش دونیا بۆ باخچەکان نەما / ئێمە لەم تاریکاییەدا تەنها دەتوانین
... بەرگەی ئەو تەنیاییە بگرین کە بێ وەفایی ئازیزانمان جێی دەهێڵن
. ئیتر تۆ لای کەنارەکانی جێهێشتن گلەیی چی لە ڕۆیشتنی ئاو دەکەیت کە وەفای بۆ تینوێتی نییە -
لیسا لە دوورگەیەکی یاسەمینی نزیک خۆشەویستییەوە دەژی کە لە مەزنەی هەموو عەقڵێکەوە -
. دوورە .. هیچ ڕۆژێکی ئاسایی پێی ناگات
هیچ ناونیشانێک نییە لە دونیادا بە تەواوی بزانێت چ ڕێگایەک دەگاتە بەردەم ئاستانەی تایبەتی -
.. گۆشەگیری دڵی لیسا
هیچ سەربوردەیەکی خورافیش لێی ڕوون نییە دەروازەی حەرەم سەرای خەنەیی -
.. عیشقی ئەفسانەیی لیسا دەکەوێتە چ قوڕنەیەکی ئارامی دونیاوە

.. عەرافەکانیش نازانن داڵغەی لیسا لە چ گەڕەکێکی بێ دەنگیدا دەژی-
.. هیچ کەسێکی تریش بۆی ئاشکرا نەبووە جەنجاڵی لیسا لە چ سەرقاڵییەکەوە نزیکە -
.. ڕۆژەکانی حەفتەیش نازانن
بەڵام لە کتێبە ئاسمانییە پیرۆزەکاندا چەند ئایەتێک بە درێژی باسی ڕەونەقی شینایەتی -
سبای ساڵحانی لیسا دەکەن کە بەیانیان بەر لەهەتاو هەڵدێت و
.ڕووناکایی دەبەخشێتە مەعنای تاریکی قووڵی ژیان
بە زمانی - عیبری وسانسکریتیش - باس لە سیحری شینایی چاوی لیسا کراوە -
کە ئاسمان بەخیلی پێ دەبات
لە تەفسیری تازەی کتێبە ئاینییەکاندا دەڵێ :- (( خودا بۆیە نەفرەتی لە ئیبلیس کردووە -
. ((کە سوجدەی بۆ لیسا نەبرد
لەو دونیاش شەقامێک هەیە لە بەهەشت بە ناوی لیساوە لەوێوە خەڵکی دەبەن بۆ سەر پردی -
.. سیرات
بێ دەنگی لیسا لە داڵغەی منەوە هێجگار نزیکە .. ئێواران لەگەڵ جوانی خۆیدا -
دەردەچن بۆ گەڕان و لە نێو زەینی منا پیاسە دەکەن .. ڕۆژەکانی حەفتە حەسودیان لەوە دێت
من چۆن توانیومە ناوی لیسا بزانم
لە چوار ڕیانی تەنیایی منەوە هیچ کەسێک لیسای نەبینیوە ڕەت ببێت ، خۆیشم هەرگیز -
. نەمبینیوە
لە گەڕەکی قەرەجاوای نسیبی منەوە هیچ ڕێگایەک ناچێتەوە بەردەم ماڵی بێ ڕەحمی لیسا -
خەڵکی فەقیر نشینی تەمەنی ستەم دیدەیی من بەحەیاتیان ئەم ناوەیان بەر گوێ نەکەوتووە -
بە مەزەنەی عەقڵی خۆم گوایە جارێک لیسا لە دووڕیانی خۆشەویستی منەوە تێپەڕیوە -
بەڵام درۆ دەرچوو وانییە
جارێکی تریش لە ساڵەکانی دەستکوورتی عەقڵمدا خەوێکی هەرزەکاریم بە شینایی لیساوە بینی و -
-: بە تەنیایی ڕەش داگەڕاوی خۆمەوە شەیتانی بووم / بەیانی وڕکم لە دایکم گرت و ووتم
ئیلاو بیلا لیسام گەرەکە )) ، گریانی من ڕووی خۆی گرت بە کۆڵەوەو )) -
تا ئەوپەڕی دونیا ڕۆیشت ، بەڵام لیسا تکای هیچ پاڕانەوەیەکی تەنیایی هەڵکورماوی منی
بە خوێی هەویریش پێ ناگات / دایکم ووتی :- (( هەی خوا خراوت بۆ بکات ، ئاخر دایکت لیسای
دیووە .باوکت لیسای دیووە بۆ بەدەردی خۆتەوە داناساکرێی .. جووتێک پێڵاوی لاستیکی
بۆ کرێم و گووتی هانێ ئەمە بەشی ساڵێکت دەکات ، هەموو بازاریشم ژێرو ژوور کرد
. (( !!..... لیسا لە قووتووی هیچ عەتارێکدا نییە
.. پیاوێک لە تەنیایی منەوە دەگری بۆ لیسا -
ئایەتێک لە غەیبەوە دابەزی و ماڵی لیسای نەدۆزییەوە -
گریانێك لە هەناسەی ساردی منەوە دەڕژێتە سەر خۆڵەمێشی بێ ڕەنگ و ڕووی مشتێک -
. بیرەوەری سفڵە
کەسێک بە چوار شەممەیەکی بێ وەفا ناڵێ بگەڕێرەوە بۆ نێو حەفتەی داماوی ئەو کوڕە -
.. ئاخر ڕۆژەکانی نقوستانن
کەسێك بە حەق سەرکۆنەی ئەو ساڵانەی ئاشنایەتی ناکات کە لە خۆڕایی لە تەمەنی ڕەنجاون -
من دڵی پەپوولەیەکیش ناشکێنم کە داوای نووری چاوم بکات ، ئیتر بۆچی ڕۆژەکانی حەفتە -
هاتوو چۆم ناکەن /نە شەممەو یەکشەممەیەک دێن بۆ لام / نە دووشەممەیەک فاکسێکم بۆ ئەنێری
نە چوار شەممەیەک ئەڵێ وەرە با کچەکەی خۆمت بدەمێ و بتکەم بەزاوای ژیان ،
نە پێنج شەممەیەک سۆراخی چەمێکی پایزی دەکات کە لەنگەری دڵئێشاوی گرتووەو

بە نێو بۆشایی بێ دەنگی ئەم هەموو بەردە گەورانەی بێ ڕەحمیدا دەڕوات بەرەو نوقتەی ڕاوەستانی دڵ ، نوقتەی کۆتایی ئەو کۆڵانەی کە ماڵی -عیزرائیلی - لێیەو دوایین وێستگەی
-: پاسەکانی ژیانەو نەفەرێکی ماندوو لە خۆیی ولە هەموو دونیا بەوپەڕی پەستییەوە دەڵی
!!.. بێ زەحمەت دابەزین هەیە لیسا -
-: کەنارییەک لە قەفەسی گۆشەگیری منا ئەگەر لێی بپرسی ژیان یەعنی چی ؟ -
دەمی دەچێت بە یەکاو نازانێت دوو قسەی ڕێک و پێک بکات دەڵێ یەعنی چاوەڕوانییەکی درێژ -
.. لە نێو لاپەڕە دڕاوەکانی تەنیاییدا
. لە نێو شەمەو یەکشەمەکاندا بە دوای مرندا دەگەڕێم ژیان لە داهاتووی مندا دەست ناکەوێت -
لە شەقامی دوو سایدی بەرەڵایی منەوە ژیان هیچ لە مەسەلەکان ناگۆڕێت ، کەسێک بپرسێ ماڵی -
مەعنای خۆشەویستی لە کوێدایە تەمەنم عاجباتی لێ دێ (( هیچ یەکێک لە ساڵەکانی تەنیایی من
گوێیان لەو قسەیە نەبووە ، دایکم ئێژێ :- ئەوە عومرم گەیشتۆتە ئەم سەنحەو تێناگەم ئەو قسەیە
-: بە تەواوی چی ئەگەیەنێت .. دایکم دەمی نەوەستاو بۆ دراوسێکانی گێڕایەوەو گووتی
-: مەهدی کوڕم لە شار هاتۆتەوەو لیسای هاوردووە ، دڵم بوو بە سەیر چی کۆڵانەکەمان دەیانپرسی -
..((.. ئەرێ مامۆستا ئەوە لیسا یەعنی چی ! ، ئەگەر زۆرت هاوردووە بەشی تەنیایی ئێمەش بدە -
-: لە قورئانی مەزندا تەماشای سوورەتی لیسام کرد ئایەتێک دەفەرموێ -
لیسا بۆ نەخۆشی ڕەبەنی باشە ، دوایی نوێژی عیشا دوو ڕوکعات سوونەتی خۆشەویستی لیسا
جەزای خێری بەختەوەری حەوت ساڵی تەنیایی هەیە ، بۆ کەسێکیش بێ وەفایی دەستی لێ
..وەشاندبێ یەکاو یەک شفای خێری دەدات و عومری ئاسوودەیشی زیاد دەکات
لە ئایەتێکی تردا ئێژێ :- بە داخەوە ئاوی حەوزی کەوسەری لیسا کەسێک لێی دەخواتەوە -
لە مەعنای ڕۆیشتنی ئاو ناگات ، قسەی باری تەعالا هیچ ڕەت و جەوابی نییەو
...ئەو بەردە ڕەقانەی کە ژیان کە لەعەزەڵەو لەسەر نەرمایی دڵ داینراون بەکەس لا نابرێت
ئەو گۆرانیانەی کتێبەکانی دانایی دەیان چڕی کۆن بوون و کەس گوێیان لێ ناگرێت ،
کەس تاقەتی نییە بەدیار چیرۆکی درێژ دادڕی تەنیایی کوڕە کەچەڵەیەکی عاشقەوە
. خۆی پیرو کوێر بکات بزان ئەنجامی ژیان دەگەتە کوێ
خەڵکی ڕۆژ تا ئێوارە سەرقاڵی ئەو قسە جوانانەن کە بۆ موجامەلە دەیکەن . دەچن بۆ گەڕان و -
تا ئەو پەڕی سنووری بێ تاقەتی داڵغەی خۆیان دەڕۆن و باس لە ئایندە دەکەن ، لەوسەرەوە
. بە دەست بەتاڵی دێنەوە و لەو هەموو دووبارە بوونەوەیە وەڕس نابن هەر دەڵێن ژیان پێچی مێزەرێکە
.. ژیان دەرگایەکی دوولایی گەورەی داخراوە هەر چۆن لێی بدەی ناکرێتەوە -
.. مەسافەیەکی درێژە لە ڕۆیشتنی بێ مەعنا هەر چۆن بڕۆیت هەر تەواو دەبێت -
لە سووڕەتێکی تردا دەڵێ :- ئەوەی لیسا ڕەفزی بکاتەوە حەوت ساڵ ئاگری دۆزەخ دەیسووتێنێ و -
. تەمەنی بە کەڵکی دڵداری نامێنێ و لەم دونیای ڕۆشنەدا فڕێی دەدەنە سەقەرەی عوزلەتەوە
بەڵام هەرچەندە من ئایەتی لیسام خەتم کردووەو بە تەجویدیش دەیخوێنم -
، !.. تێناگەم لیسا یەعنی چی
!... هیچ شەقامێکی تریش تێنەگەیشتووە لیسا لە باوەشی چ شەوێکی ڕەشپێستدا دەخەوێ
تەنیا ئەوەندەم لێ عەیانە عاقیبەت بەدەردی لیساوە دەمرم و
. !.. دەواکەی لە هیچ کوێیەک دەست ناکەوێت
(( پێغەمبەرێک لە میحرابی جوانی لیساداوویستی بڵێ (( لیسا بە حەقی ئەم قورعانە خۆشم دەوێی -
وەلێ هەرچەندی کرد زمانی نەیهێناو وەحێکی بۆ دا نەبەزی . لەسەر دیوارە چڵکنەکانی ئوتێلی
ساردی غەریبی دوادوایی تەمەنیا بە پارچە خەڵوزێکی تاریکی ناخی خۆی دواین بیرەوەرییەکانی
. (( نووسی (( مخابن پێغەمبەرایەتیش دادی تەنیایی نادات

عابیدێکی لە خواترس شەوو ڕۆژ لەسەر بەرماڵی ئیتاعەت دەپاڕێتەوە :- (( خوایە لەبەر خاتری -
..((. جوانی لیسا لەم تەنیاییە مەحفوزمان بکەی
با) یەک نەیزانی جوانی لیسای هەڵدایەوە بەهەشت گیانی کەوتە دەرەوە) -
.. کتێبە پیرۆزەکان فتوایان دەرکردو گووتیان خۆمان بەقەستی دۆزەخمان هەڵگرتووە -
ئاو) مانی لە ڕۆیشتن گرت و گووتی ئیتر من بۆچی بڕۆم مادام ژیان لێرەیە) -
با) کە جوانی لیسای بینی داڵغەی ڕۆیشت وخۆی دا بەنێو قەدی درەختێکی ڕەشتاڵەداو) -
(( گەڵاکانی لێ هەڵوەراند ، گووتی :- (( دەبێ عەفووم بکەی ئاگام لە خۆم نەبوو
چەمێک بەدەم ڕۆیشتنەوە هەر تەماشای لیسای دەکردو هۆشی لای خۆی نەمابوو -
پێی لە تاشە بەردێک هەڵکەوت وبەدەما کەوتە نێو هاژەی تەریق بوونەوەیەکی سارد
... ((بۆقەکان دایان لە قاقای پێکەنین )) -
لایەک لە دیواری تەمەنم ڕووخاو پیرێتیم کەوتە دەشتە دەشتەوە لیسا سەری سوڕما کە تەنیایی -
دڕاوی منی بینی پینەم کردووە ، گووتم دەستم ناڕوا هیچ خۆشەویستییەک شک نابەم
بیکەمە بەرم ئەگەر ئەتوانی نیوگەز خۆشەویستیم بدەرێ بۆ ئەم جەژنە ئەیکەمە کراسێک بۆ دڵم
.. لیسا هیچی نەوت تەنها ئەو کاتەی کوشتمی گووتی :- ئاگات لەخۆت بێت با سەرمات نەبێ -
ئەم هەموو جوانییە چییە لیسا .. خۆتت بەرداوەتە گیانی تەنیایی من .. ئاخر گوناحم من -
!!.. بەرگەت ناگرم
ئەم هەموو ژیانە ئیسرافە لیسا.. من پێویستم بە ڕۆژەکانی حەفتە نییە هەمووی بۆ تۆ -
..هەموو ژیانی ئەو دونیامیشت دەدەمێ بەڵام تۆ ماچێکم بدەرێ بەقەرز..؟؟
ئاخر ماچ دوا خۆشەویستی (ئاوە ) بۆ حەوزێکی بەتاڵ کە پڕە لە بیرەوەری تاڵی قەوزەی بە جێماو ،
هەڵهاتنی خۆرەتاوێکی خۆشە لە ڕۆژێکی ساردی زمستان / سەلامی مانگە لە تاریکی
پێکەنینی پەلکە گیایەکی عازەبە بۆ نەسیمی فێنکی بەیانییەکی گەنج / چاوداگرتنی شەپۆلێکی
... عەیارە لە کەنارێکی بەتەمەن /پێشوازی کردنی گوڵێکی سەخییە لە پەپولەیەکی ئاشنا
. دەڵێ ها دیار نیت... ماوەیەکە بێ ڕەحم بوویتە سەرمان لێ نادەیت
. هاتنی چاوەڕوانییەکی ناوەختە بۆ سەردانی بێ ئومێدییەکی پەشۆکاو کە تەنیایی خەریکە ئەیکوژێت
خوڵقکردنی میوانێکی ناوەختە بۆ سەر سفرەی گەرمی ژیان و پێی دەڵێت تۆ لەماڵی دڵی
. مندای دەبێ ئەم پیاڵە حەنانەتەیش لەبەر خاتری من بخۆیتەوە
دەعوەتکردنی غەریبییەکی ساردە لە نێو تاریکی ئێوارەی شارێکی جەنجاڵدا بۆ بەردەم گەرمایی
ڕوناکی / حەنانەتی درەختێکی پیرە کە بە باڵندەیەکی ژێر باران دەڵێ کوڕم با سەرمات نەبێ وەرە
بۆ ژێر گەرمایی چەتری گەڵاکانی من/ ئاوڕدانەوەی (با) یەکی خێرایە لەوسەری ئێوارەی کۆڵانی
دارستانەوە بۆ گەڵایەکی هەرزەکار / ناز کردنی شکۆفەی غونچەیەکی بەهارە لە دوا کەوتنی دەنگی
جریوەی باڵندە دەڵێ ئەوە لە کوێ بووی شتە پیپس بیرم کردیت / چاوەڕوانی بەپەرۆشی ئەستێرەیە
/ لە درەنگ هەڵاتنی مانگ دەڵێ ئەوە بۆ ئەوەندە دواکەوتیت لە ئێوارەوە چاوەڕێت دەکەم
ماچ سوجدە بردنی خودایە بۆ قیبلەی موبارەکی عیشق / دوا تەعبیری زمانە لە وەسف کردنی
جوانی / گەیشتنی (ئاوە ) بە ئەو پەڕی عەرشی مەزنی قووڵایی خۆی / دوا ئایەتی قورئانە لە نامە
ڕازەوەکانی خوداوە کە بۆ پێغەمبەرێکی ئازیزی خۆی دەنوسێ خۆشم دەوێی / دوا کەلامی گەرمی
ئاوە ) کە لەبەرزەخی ڕۆیشتندا بانگی پەلەوەرێکی تینوو دەکات دەڵێ بێ بۆ ئێرە بۆ ژێر ئەم دار )
. !!.. هەنجیرانە من هام لە نێو گەڵاکاندا خەریکم ( سێبەر ) دەخۆم
.. لیسا ناوکی چاڵە .. جوانی دەڵێ من لە ژیانمدا شتی وام نەبینیووە -
لە نێو فوارەی حەوزی کەوسەری فەسڵی تەڕایی لیسادا چوار وەرزە بەهارێکی قژ ڕەش -
لەسەر پشت ڕاکشاوە ..( ئاو) دەڵێ چیت کردووە خودایە من نەمزانی ڕەنگی بەهار

!!.. بە ڕەشی جوانترە لە داڵغەی مێینایەتی تۆخی سرووشت و نەرمایی سەوزەگیا
مانگ لە حەسرەت جوانی لیسادا تووشی نەخۆشی زەردوویی هات و -
... هەموو جارێکیش هەر بەو دەردەوە هەڵدێت
جوانی لیسا پایزی بەدەردێک برد .. تووشی پەرکەمی گەڵاڕێزانی کردو -
فرۆیدیش- سەری لێ دەرناکات -
جوانی لیسا ئادەمیشی لە خشتە برد ئەو هەموو نەوەیەی پێ خستەوەو کەچی هیچیان لە لیسا -
... ناچن
جوانی لیسا دەکەوێتە نێوان مانگ و خۆرەوە ، لە نێوان دوو گوڵی زەنبەقی سوورو شینەوەیە -
.... کە لە پارکی تەنهایی منەوە زۆر دوورەو هەرگیز بە خەیاڵیش بڕی پێ ناکەم
بێ ڕەحمی دڵی لیسا دەکەوێتە سەرووی بەردی مەڕمەڕەوە نزیک بەردی خارایە -
لای تاشە بەردەکانی دڵڕەقی بەنی ئادەمەوەیە کە گومڕایی سەرخۆش دەبێت
بە پێوە میز دەکاتە سەر چارەنووسی شعوری بەیانییەکی شەرمن و تووڕەیی جوانی تەریق دەکاتەوەو
.سومعەی خۆشەویستی دەشکێنێت
جوانی لیسا لای پارکی ئاوەکەوەیە من کە ئاوم بینی دڵم چوو لە لیسا ، -
هەر کەسێک حەزی لە لیسا نییە با ئاو نەخواتەوە ، هەر کەسێکیش حەوێجی بە لیسا بکەوێ
... حەوێجی بە مردن نامێنێ و بەدەست ژیانەوە ئەبێتە فلیم
باخچە لە شکڵی قامەتی عەرعەرو سێبەری تەڕی وەنەوشەیی لیسا دروست کراوە ، -
.. هەموو ڕەنگەکانی تری مەعنای ژیانیش تەقلیدی جوانی لیسا دەکەنەوە
بەڵام نە هیچ ڕەنگێکی ئایندەو نە ئێستاو نە ڕابردوویش وەک و سەوزایی جەستەی باغی ئیرەمی
... لیسایان لە دەست نایەت کە هەر ڕۆژی نەوعێک ژیان دەگرێت پێشتر کەس نەیبینیوە
لەهەر کوێیەکی جەستەی لیساوە بڕۆیت بۆنی بەهەشت سەرسامت دەکات -
لە هەر کوێیەکی نیگەرانی منەوە تێپەڕیت بۆنی تەنیایی کاست دەکات -
جوانی لیسا هەموو بەیانییەک تەم دەگرێ و ئاورینگ دەبارێنێتە سەر شێی تەڕایی -
.. گەردنی بلووری جوانی
لەو سەری دونیاوە تەماشای بکەی تریفەی جوانی لیسا دیارە کە لەنێو داڵغەی شەوو ڕۆژی منا
.. بریقەی دێت
..گوڵ ڕەنگی لە ڕوخساری لیسا وەرگرتووە .. عەتریشی لە هەناسەی -
بەهار لە بۆنی مێینایەتی جەستەی لیساوە دروست بوو -
خواوەند کە لیسای دروست کرد لە سزای قیامەت پاشگەز بووەوەو بەهەشت و دۆزەخی هەڵگرت -
لێرە حەفتە هەشت ڕۆژە دوای شەمە لیسا دێت ، ئەگەر لیسایشی لێ دەربکەیت -
... هیچ ڕۆژێکی نامێنێتەوە بە ساقی
. ئەگەر لیسا نەبێت جوانی خۆی لە ئەسڵا هیچ مەعنایەکی تری نییە شانازی پێوە بکات -
بەڵام لیسا بەو هەموو جوانییەوە هیچ مەعنایەک نابەخشێتە ڕەنگی تاریکی و تەنیایی تۆخی من -
... کە بە هیچ خۆشەویستییەکی شەرابیش کاڵ نابێتەوە
ڕۆژەکانی منیش بە کەڵکی ئەوە نایەن دوو قسەی خێری لەگەڵ لیسادا پێ بکەم -
.هەموییم داوە بەجگەرە ..؟؟
ئیتر بە هەموو عەقڵێکی سەقەتی خۆمەوە لە نێو کتێبەکاندا بۆ لیسا گەڕام -
... کە لەواسواسەی خۆمەوە تووشم هاتبوو
پیرێتی لەسەر ڕێگاکانی مردندا ڕێی لێ گرتم (( بە چ عەقڵێکەوە ئەم لاپەڕە تۆخانەی ژیان -
هەڵدەدەیتەوە کە بە جەخاری مردن کۆتایی کۆتایی دێت ..!! دانیشە بۆ کوێ دەڕۆیت خەریکی

چ بەزمێکیت لێرەوە هیچ ڕێگایەک نییە بۆ هەڵاتن لە تەنیایی بڕۆ بۆ خۆت لەنێو کتێبەکاندا
. ((.. بەتۆزی خۆتەوە داسەکرێ
لیسا لە ئایەتێکدا هاتبوو کە خزمی نزیکی بارانەو زۆرتر لەگەڵ فەسڵی بەهاردا دێت -
بۆ ڕۆخەکانی جوانی پیاسە دەکات
مەلائیکەتەکانی ڕەحمەت لەسەر چاوەی ئەو ئاوە ڕۆشنەوە دەستنوێژیان دەگرت کە بەنێوان -
مردن و ژیاندا دەهات گووتیان هیچ کەسێك بەناوی لیساوە لەم سنوورانەی زیندەگییەوە
..نەهاتۆتە نێو دونیا
لیسا لە ئەسڵا هەر نییە ئەگەر هەشبێت درۆیە .. بەڵام من دڵم چووبوو لە درۆیەک -
کە ناوی لیسا بوو ، باوەڕم بەعەقڵی خۆم نەدەهات ، ملی ڕێگاکانی غەشیمیم گرتە بەرو
گوێم نەدایە تەعلیقە ناخۆشەکانی تەمەن کە منەتی چرچ و لۆچی پیرێتی دەکرد بەسەر دەم و
چاومدا .. بەو ناونیشانەی کە دڵم پێی دابووم هاتم لە ئاوی گەنجێتی بە نیوەو ناچڵی پەڕیمەوە
ئەوبەری ژیان گەیشتمە سنووره سەختەکانی مردن و لامدایە لای بێدەنگییەکی
قووڵی -بووزایی- لەو شوێنەی کە پیرێتی لەسەر جێگاکانی مردن ڕاکشاوەو
کەس نییە قومێک لیسای بداتێ لە دوورەوە چاوەڕوانی ئەجەل دەکات بێ هوودەیی نزیکترین
خزمی ژیانەو تەمەن بەشی پاڕانەوەیەک ناکات لە لیسا ،پیرێتی لە ناوەڕاستی شەقامەکانی ژیاندا
بەبەرچاوی ئەو هەموو جوانییەی لیساوە یەخەت پێ دەگرێ و دەڵێ مردن پەنجا ساڵ ژیانی
بەقەرز داویتەتێ بۆ نایدەیتەوە .. پیرێتی کەروێشکیش بە عارەبانە دەگرێت و
.. حەماڵی بۆ مردن دەکات
خونچەیەکی تازە ڕەسیدە هێشتان سێبەری کچێنی خۆش نەبووەو بۆنی بوخڕی حەیزی -
ئاشکرا نەکردووە بۆ هەوەسی جوانی باغ مردن لە دوورەوە تەعلیقی لێ دەدات
. بوولبولێک لە نێو ژەنگی قەفەسی تەنهایی ساڵەکاندا سەرو ڕیشی سپی دەبێت -
ڕەنگە دوو بەهار نەیناسن کەچی مردن بە عەمدەن هەموو ڕۆژێک لە نێو شکۆفەی ڕەونەقی
وەرزەکاندا پیاسە دەکاو بەکەیفی خۆی دەستکاری چارەنووسی تەمەنی هەرزەکاری جوانییەکانی
پاکیزەیی دەکات ، هیچ کتێبێک ناتوانێت پێی بڵێت :- ئەرێ تۆ بۆ ئەوەندە خوێنی خۆت تاڵ دەکەیت
ئەم (ئاوە ) ڕۆشنەی ژیان بەتەنها بۆ تۆ نییە بیخۆیتەوە ئاخر گوڵەکانی پەژموورد ەیی جوانی ئێمەش
!!... نەفسیان هەیە
لە نێو لاپەڕە زەردەکانی تەنهایی مەحاڵ وتۆز لەسەر نیشتووی کتێبەکاندا داڕزیام -
. ئەو ناونیشانە خەیاڵیانەی حیکمەتی کتێبەکان دابوویان پێم هیچیان ڕاست دەرنەچوون
!!!.. مخابن کتێبەکان درۆیان کرد -
لیسا بە هیچ ڕێگایەکی فیقهو مەنتیقی خۆشەویستیدا نەڕۆیشتبوو، ئەسڵەن لە ژیانیدا -
خۆشی لە سێبەری سەری هیچ فەلسەفەو نەحو و سەرف و هیچ گرامەرێکدا نەدەهات ،
هیچ زانستێکی زمانەوانی و هیچ ڕێزمانێکی دوانزە عیلمیش لە کردارە سەیرو سەمەرەکانی
ڕابردووی تێپەڕیوی ئەنفال کراوی من و، ڕانەبردووی تێنەپەڕیوی برینی ژەنگرتووی ))
سەر دڵی ووڵاتەکەم و ، داهاتووی سەقەتی من و زۆر بڵێی زمانەوانیدا )) سەریان لە ڕستەی
گریانی بێ سوودی من دەر نەئەچوو کە لیسا چ کەتنێکی ناوەتەوەو چ فرمانێکی ڕانەبردووی
بەدبەختانە لە چارەنووسی بەد فەساڵی منا ئەنجام دەدات و ئیعرابە شوومەکانی شعوری بریندار و
ستەم لێ چۆڕاوی من بە چ فەتارەتێکدا دەبات ، ڕووناکایی چ خۆشەویستییەکی گەورە لە ناخی
... منا دەکوژێنێتەوەو دەمکات بە تاریکە سەڵات
مخابن ژیان لە نێو کتێبەکاندا خەوێکە هەرگیز نایەتەدی ، ستەمی تەنهاییەکی کوشندەی -
... دوورە پەرێزی ژیانەو ڕێی ناکەوێتە سەر هیچ ئاوەدانییەک

لە نێو تارمایی بێشەڵانی تەنهایی کووشم هەڵاتووی بەر بارانی چاوەڕوانییە ساردەکانی خۆمدا -
وێڵ بووم و سەرم بە هیچ لایەکی سەبووریدا دەر نەکرد ، حیکمەتی هیچ کتێبێکی دلۆڤان
. دەستی نەگرتم و لەم شەقامە جەنجاڵییەی تەنیایی بمپەڕێنێتەوە
ڕێی هات و نەهاتی داستانە کۆنەکانم گرتە بەرو ملم پێوە نا. بە نێو تارمایی ڕاڕەوە سەختەکانی
حیکایەتی ئەفسانە کۆنەکانی دوایی دونیادا ڕۆیشتم هەتا ڕۆیشتنیش بەشی کرد هەر ڕۆیشتم ،
سەرم لەو سەری سپێتییەوە دەر چوو ، گەیشتمە بەردەم دەروازەی شارێکی گەورە کە بەسەدە کۆنەکان
داخرابوو بە هیچ خوێندنەوەیەکی تازەیش نەدەکرایەوە ، سۆراخی ناونیشانێکی دڵی لیسام کرد
کە بە ئاوی ئاڵتوون نوسرابوو بە ئاسانی نە ئەدۆزرایەوە . ناچار بووم سەبری - ئەیووبم- بە خەزێنەی
. قاروون- کرێ و نیوەی عومری -نوحیشم - قەرز کرد هەر بەشی نەکردو نەمدۆزییەوە -
ژیان تەواو تاریکی کرد ، تا دەهاتم دونیا تاریکتر دەبوو ،ڕێی هیچ هاتنەوەیەکم لەبەردەمدا نەما
. بێجگە لە بێدەنگییەکی پڕ لە بێ مەعنایی قسە من هیچ شتێکی ترم لەدەست نایەت بیگێڕمەوە
بێجگە لە ڕاڕاییەکی مەمرەو مەژی من لە هیچ کوێیەکی تردا نیم ، لە نێو بیرەوەری هیچ دڵێکی
.. تەڕدا ناژیم ، لە هیچ کوێیەکی خەیاڵی گەرمی ئاسوودەییدا ئۆقرەم نەگرت
. لەو دیوی مەعنای سەرشۆڕی ژیانەوە هیچ مەعنایەکی دیکەی سەربەرزیم نییە بۆ شانازی
ئیتر لە خۆمەوە درۆی چی بکەم بۆ بڵێم ئاو لە ڕۆیشتندا گرنگە .. نەخێر هیچ شتێک گرنگ نییە
لەبەردەم پرسیارە سەرزلەکانی دەستەو وەستانی بوونی شڵەژاوی خۆمدا نوقتەی ڕووگیری -
کۆتایی ڕستەیەکی بێ سەروبەرم (( من بۆ هاتووم بۆ بەردەم ئەم ئاوێنە جوانەی ژیان
((. کە هیچ کوێیەکی ڕۆشنایی دونیای لێوە دیار نییە
. لە نێوان مردن و ژیاندا بێ مەعناییەکی عەنتیکەم بۆ هیچ تەنیاییەکیش دەست نادەم -
(( تەنها بۆ مردن دەشێم کە هەر جارێک پێم دەگات دەڵێ (( ها حەرام زادە لە کوێی ..؟
دەشێ ژیان لەو مەعنایە گەورەتر بێت کە کتێبەکان باسی دەکەن وەلێ ئەمن تێی ناگەم ، -
.!!... عەیبیش نییە مرۆڤ نەزانێت بۆچی ئاو دەخواتەوە
چ غەشیمانە لەسەر مێزی خۆشباوەڕی ئەو هەموو گەنجێتییەی خۆمم دۆڕاند -
باشە عەیب نییە من ئەو هەموو ساڵە خەریکی چ دەردێک بووم .. بەدیار گەمژەیی چ -
!!.. (( داڵغەیەکەوە دانیشتبووم (( دایکم دەیگووت شاڵا مارێکم بهێنایە لە جیاتی تۆ
لیسا نییە .. ئەگەر هەشبێت دەرگای نییە .. ئەگەر دەرگاشی هەبێت بۆ من ناکرێتەوە -
.. بۆ -کافکایش- نەکرابوویەوە .. - نیتشە - هەر لە عەزەلەوە ئەو دەرگایەی بە شێتی زانی
بەسەر شۆڕی پیرێتییەکی بێ تاقەتەوە کە هیچ دڵنەواییەک داڵدەی نادات لە مردن -
پڕ بووم لە هەناسەی گەرمی کەبت کراوی ژیان و گوناهی ساردی پەشیمانی ساڵەهایەک
کە نەمزانیووە بۆچی ژیام و ، سەد ساڵی دیکەش بژیم هەر تێناگەم بۆچی دەژیم
بۆنی حەیفی چ تەنیاییەکی قێزەونم لێ دێت ، بۆنی تەنیایی ڕۆژە ڕێیەک دەڕوات -
هەموو پارکەکانی جوانی لیسا لەبەر بۆنی تەنیایی سووتەمەرۆی من هەڵدێن و دەچن لەو دوورەوە -
لە بەر سێبەری تەڕی چرۆی ئاسوودەییەک دائەنیشن کە زیاتر لە قەناعەتی منەوە نزیکە
. ئیتر خەریکم تێدەگەم کە بێ نوێژی گیانی تەنیایی چڵکنی من بە هیچ خۆشەویستییەک دەر ناچێت -
. ناچار بووم دەستنوێژم بەو بێدەنگییە گرت کە بەهەزاران ساڵی میلادی نایەتە دەربڕین -
لەسەر بەرماڵی خانەقای لیسا وەمەزهەبی شافعی حەشاماتێکی گۆشەگیر لە سەفای ژیان ئیمانم هێناو
قامەتی نوێژی تۆبەم بەست کە لە سەرەتای ساڵەکانی زاینی یەوە هاتبوون بۆ حەج و
نەگەڕابوونەوە بۆ نێو فەسڵەکانی ژیان و لەوەندە زیاتر نەیاندەویست خۆیان بە ئایندەوە خەسار بکەن
کە بەردەوام فلیمەکانی جاکیشان دووبارە دەکاتەوە )) ، حەشاماتێک بە درێژایی سەدەکانی ))
ڕاڕایی سرەیان بەستبوو هاتبوون بۆ سەفاو مەروای دیدەنی لیساو ڕەجمی تەنیایی خۆیانیان دەکرد و

.. چاوەڕوانی وەسوەسەی هاتنێکیان دەکرد ، دەیانگووت :- (( یەکێک دێت .. یەکێک نایەت
یەکێک دێت ناوی لیسایە ، لە ئینجیلی -لۆقادا-پێدەکەنێت تا کۆتایی ئەندازەی لاپەڕەکانی
بەختەوەری ، لە ئینجیلی - مەتادا - بێدەنگەو هیچ قسەیەک ناکات هەتا بارتەقای بارستایی
. کتێبەکانی پەشیمانی کەسیش تێناگات لەبەر چی
ئەگەر بێت لەوانەیە ئێواران بێت ، لەسەر بەردە نوێژی ئەم گوناح و پەشیمان بوونەوەیە -
.. تۆبە لە کفرەکانی گوناحی بێ ڕەحمی دەکات کە هەموو جارێک دووبارەیان دەکاتەوە
هەموو حەفتەی جارێک دێت .. یان هیچ جارێک نایەت/ بەڵام لەوانەیە هەر نەیەت
لەوانەشە بێت بەلەشی ڕووتییەوە خۆی پیشانی تەنیایی ووجاخ کوێری (با) و
.. سەر هەڵگرتنی ڕۆیشتنی بێدەنگی ( ئاو) دەدات
لە دەروازەی یەکێک لە سەدەکانەوە دێتە ژووری و دەچێتە بەردەم ئەو کەنیسەیەی -
کە لەشکڵی دڵڕەقی خۆی دروست کراوە .. دڵی هەموو مۆمە تۆراو و تۆز لەسەر نیشتووەکانی
. قوژبنی تاریکایی دونیا ڕوناک دەکاتەوە
بۆنی بوخڕی هەناسەی گەرمی مێینایەتی هەموو ئەم دوورگە دوورانەی فەرامۆشی دادەگرێت و
.. هەموو ئەم ناوە چۆڵەوانییەی تەنیایی پڕ دەکات لە شەوقی ئاوەدانی
ئەگەر بێت بەر لە بەهار دێت ، لێرە مانگ هەڵنایەت لیسا لە جێگاکەی دادەنیشێ و -
.. لێپرسراوی ڕەنگی جوانی فەسڵەکانی بەهارە
ئەگەر بێت دوای هەموو وەرزەکان دێت لێرە ساڵ نییە لیسا حاکمی ولایەتی ڕەونەقی جوانییەو
. حوکمی قەڵەم ڕەوەکەی تا سنووری سەوزەگیای ئەو دونیا دەڕوات و پایتەختەکەی ناوی بەهەشتە
دێت داوای لێبووردن لە حەزرەتی -مەسیح- دەکات کە کاتی خۆی ڕەفزی کردبووەوەو -
..دەیشیزانی پێغەمبەرە / خاچی سەر دڵی یەسوعی مەسیح بە برینی گەورەی ئەو تیرە گریا بوو
گوڵەکانی غورووری جوانی لیسا تا ئێستاش لەو گوناحە پەستن / پەشیمانی لیسا سزای قیامەتی
ڕۆژە گوناحبارەکانی حەوا دەدەنەوەکە چۆن دڵی ئەو هەموو تەنیاییە دەشکێنن بە بێ ئیزنی خودا
/ مخابن گوناحەکانی ژیان هەمیشە بە بێ هیچ سزایەکی قیامەت تێدەپەڕن -
!!.. کەسیش لە کردەوایان عاجز نابێت / هیچ بەیانییەکیش لە دووبارە کردنەوەیان وەڕس نابێت
بۆنی بەهار هات ، بۆنی کراسی یوسف هات ، بۆنی بوخڕی لیسا هات .. هەموو پەلەوەرەکانی پێشوازی -
.. هێلانەی بەهاریان چێ کرد
هەموو ئەو ناوەی دڵتەڕی بەنەرمە گیای سەوزایی ڕاخرا ..( ئاو) ڕیزی ڕۆیشتنی گرت،
منیش سرەم گرت ، ڕۆژەکانی حەفتەیش سرەیان بەست ، کتێبەکان لە پێش هەموو کەسێکەوە
.. سرەیان بەستبوو / مانگ هەڵهات و ڕۆژ دار دەستێک بەرز بووەوە
هەموو ژیان لە تەداروکی مقۆ مقۆی هاتنی جوانی لیسادا کەوتینە سەرو فیتراقی دەمەتەقێی
چاوەڕوانییەکی گەرمەوە / ( ئاو) راوەستاو ( با) بە هیچ لایەکدا نەڕۆیشت ، من کەوتمە سەرو سۆراخی
بێدەنگییەکی قوڵەوەتا دوا هەناسەی ژیان و تا دوا چۆڕی عارەقی گەنجێتیم ڕاوەستام و
. ئاوی بێتاقەتی سەبری چاوەڕوانیە کزەکانم داهاتن، ساڵەکان هاتن و هاتن ، لیسا نەهات
پیری هات و هات لیسا هەر نەهات .. مردن بە کۆڵێک جامانی و مشکی تێکەڵەوە هات
لیسا هەر نەهات و نەهات ، ئاخری زەمانیش هات لیسا هەر نەهات ، بەڵام بۆنی بوخڕی ئەو ناوەی
داگرتبوو
قەشەکانی کەنیسەی ڕاڕایی عەقڵی من گووتیان مەڕۆن لەوانەیە دوای بەهار نەیەت -
. بەڵام سەد دەر سەد لەوانەیە دوای ئاخری زەمان بێت .. من بڕوام بەو گێلێتیەش هات
بەڵام عومرم لەوە زیاتر بەشی نەکرد لە پشت پەنجەرە شکاوەکانی چاوەڕوانییەوە دانیشم
مردن لە پشتەوە چاوی گرتم و گووتی بزان دەمناسیتەوە هەناسەم شڵەژاو تەمەنم ئیحراج بوو -

-: شایەتوومانێکم بەسەر شانی ناسۆری ووڵاتەکەمدا هێناو ئایەتەلکورسیەکم خوێند -
گووتم دەتوانم ڕستەیەک بێزاری بۆ ئەو کەسە بنووسم کە منی دروست کرد بڵێم جارێکی تر خەڵقم -
مەکەرەوە سپاس ، ڕستەیەک بێدەنگیش بۆ ئەو گلەییانە جێبهێڵم کە عەقڵم پێیاندا نەشکاوە بیانکەم
لەسەر بەردە نوێژی گریانی بەکوڵی - مەسیح -یەک ڕوکعات نوێژ بۆ ئەو خۆر ئاوایە بکەم
-: کە نزیکترین هاوڕێی تەنیایی بێدەنگییە سادەکانی من بوون پێی بڵێم
ئەی خۆر ئاوا ئەی حەزرەتی دادی بێدەنگی کش ومات ، ئەی قیبلەی ڕوناکایی چیرۆکی درێژی -
دەردی گرانی دڵی من .. کەی لە ووڵاتی منەوە هاتیت کەی ئاوا بووی .. من ئیتر نایەمەوە
سەلام لەهەموو ئەو کەسانەی دەکەم کە هەواڵم ناپرسن ، دەستی کتێبخانەی گشتی ماچ دەکەم
!.. من بە کورتی باشم بەڵام بە تەفسیلی نەءء ... کە هاتیت دایکم نەخۆش نەبوو
ووڵاتەکەم نەدەگریا ..!! ( هێرۆ ) لەبەردەم ئاوێنە تەڵخەکانی چاوەڕوانیدا بیری لە چ ڕەنگێکی ژیان
دەکردەوە .. من هیچ ڕەنگێکم نییە بۆی بنێرم .!! کچەکانی چاوەڕوانی لەبەردەم ئێوارانی
پەستی قەیرەیی و دەرگای دوولایی داخراوی بێ ئومێدی دائەنیشن کە هاتن لە هیچ کوێیەک
دەست ناکەوێت ..!! شەقامەکانی دەست بەتاڵی خەو بە چ ڕۆژێکی خۆشی کارکردنەوە دەبینن
!!.. کە هیچ خەوێک نایەتەدی ..!! منداڵەکان دەچوون بۆ قوتابخانە ..!! باران دەباری
مەچکۆ- زەمی نەدەکردم ..!! کۆڵانەکانی دەست تەنگی جلی عازێتییان داکەندبوو-
..کە جەنگ لەجاران گەنجترەو کۆستکەوتەیی تابێ جوانتر دەبێتەوە ..؟؟
کاک خۆر ئاوا ئەگەر دەتوانی بەیانی زوو منیش لەگەڵ خۆتدا هەڵبستێنە دێمەوە -
... لە نێو ئەو - ماکۆندۆیەدا - دەمرم ژیان لە هیچ کوێیەک دەست ناکەوێت-
مردن دەنگی هەڵبڕی و خیزەی گەرمی هەناسەی لە پیاوێکی جگەرە کێشی بەساڵاچووی لادێی -
.. دەکرد کە لەژیانیدا دگانی نەشۆردبێ .. گووتی بە چییەوە خەریکیت درەنگە ژیان مەحتەل مەکە
!!.. -گووتم کاتژمێر چ دەگێڕێتەوە .. گووتی سەعات چارەکێکی دەوێت بۆ -عیزرائیل -
مردنم لە نزیکەوە دەناسی برادەری کۆنی باوکم بوو / تەبیعەتی باوکمی هەڵگرتبوو -
.. کە لە سێبەرەکەی خۆیشی تووڕە دەبوو (ئاو) ڕادەچەنی و من زارەتەرەک دەبووم
کە دەهاتە ماڵمان باوکم دەیگووت (( خوێڕی دەستی مامەتت ماچ نەکرد )) ، کە دەشرۆیشت
دەبووایە من پێڵاوەکانی لەبەر پێیاندا دابنێم و یەکێکیشمان تا بەردەم قاپی ئەڵهەو ڕەوانەمان
بکردایە ... وەڵێ ڕاستی هیچ جارێکی تر مردنم بەم میهرەبانییە نەبینی بوو زۆرتر سیمای لە پیاوێکی
ژن مردوو دەچوو کە بەدەست کۆشێک ڕوحی پشیلە ئاسای منەوە گیری خواردبێت
.. من چەندین جار لە حەمامدا پشتی مردنم شۆردبوو -
.. مردن دڵی چووبو لە خوشکەکانم و لەگەڵ هەر هەمووشیاندا جووت دەبوو
مردن بەبەرچاوی باوکیشمەوە سواری دایکم دەبوو
دوای برادەرەکانیشم مردن نزیکترین هاوڕێی تەنیایی من بوو
هیچ کاتێک مردن نەیدەشڵەژاندم وەک و سەگەکەی - پاڤلۆڤ- ڕاهاتبووم بە مردن -
باوکم چەندین جار دەیکوشتم و لاشەکەمی فڕێ دەدایە بەردەم ئینسافی برادەرەکانم
... کە بە بەرچاوی -عومەری کوڕی خەتابەوە - دەیانخواردم
جەللادەکانی هاوڕێم کە خەنجەری غەدریان لە زامی تەنهایی بەسوێی منا جێهێشت و -
خۆیان هەڵاتن بەرەو ئایندە من لای مردنێکی چەپڕەو دەست بەسەر بووم کە قەناعەتی
بە دیموکراسییەتی باران نەبوو ، بە هیچ شێوەیەک سازشی لەگەڵ میهرەبانیدا نەدەکرد ،
گاڵتەی بە عەقڵی -کاڤکا- دەهات هەموو جارێک هەڵدەشاخا بەسەروچاومدا وڕوشکێنی دونیاو
قیامەتی دەکردم و منەتی ژیانی دەکرد بەسەرمدا و دەیگووت :- تۆ عەبەسیت ، تۆ ڕوخاویت
... تۆ ووردە بۆرجوازیت ، تۆ لە پێش سەرمایەداریشەوە بمرە

کاتێکیش کە بێ وەفایی - ئیلهام- لە گەرمایی دڵی خۆیدا دەری کردم و هەموو دەرگا ئاسنینەکانی - تەنیایی لێ داخستم ، تەزی مردن هات بە لەشماو ، ئاوەدانییەک جێی هێشتم بۆ تەنیایی / کتێبەکان لە ماڵا نەخۆش کەوتن و ، - سەعدی- دەستی کرد بە گریان / ڕوناکایی نێو سۆمای دیدەم مرد حەوزێک ماسی لە دڵمدا ووشکی کردو ، دەیان پەپولەی نارنجی لە دارستانی شعورمدا هەڵاتن / بۆ بەردەم ئاگرو ، هەناسەم بۆ کڕوزی گرت
سەدان ڕەوە باڵندەی ئومێد لە ناخمدا خۆیان کوشت و ، هەزاران گەڵا لە دارستان کۆچیان کردو خۆیان دا بە دەم ئاوەوە ، هەر چی سێبەر بوون باریان کرد ،
هەرچی کانی تەقیوی ناخم بوون سەریان هەڵگرت بۆ ووشکانی ،
لەبەردەم عەقڵی زەعیفەی چەپکێک کەنێرەی تەڕدا ڕووبارێکی تەحەموول بووم بەرگەم نەگرت و ووشکم کرد / لە ترسی تەنیاییەکی قووڵ کە شەوانە لە پشتەوە دەیترساندم هەڵاتم بۆ بەردەم مانگ و / چاوم بڕییە تکایەکی مناڵانەو سەری پاڕانەوەم بۆ ئاسمانی چاوەکانی نەوی کرد و -: ئیکلامێکی شاهانەم کێشا ، سەری بێدەنگیم داخست ودەستی سەدەقەم درێژ کرد گووتم ئیلهام -دایکم نەخۆشە چاوی دێشێ کەمێک هەتوانم پێ دەوێ ، کە مێک خۆشەویستی گەرمم - ... دەوێ بۆ سەر دڵم
گووتم ئەی مانگ خودا بەرداری نییە لەم تەنهاییەدا بە بەرچاوی ئەم هەموو ئەستێرانەوە - .. مەمکوژە گیاکان زۆر پێیان ناخۆشە کە شعوری ئاو دەشکێنیت .. کانی بزانێت قاری دێت عەیامێکی دوورو درێژ لەبەردەم مردنێکی نەخوێنەواردا چۆکم داداو بەدەست ژیانەوە گیرم خوارد / لە دەست ستەمی زۆرداری تێنەگەیشتنی باخچەیەکی ناحاڵی لە دەنگی جریوەی سێبەرو کەم تەرخەمی دارستانێک لە گوێ گرتنی هاژەی (با) و درەختێکی کەم ئاوەزی تێنەگەیشتوو لە خوڕەی ڕۆیشتنی (ئاو) و ، بێ دەربەستی تاشە بەردێکی بێ مروەت لە لرفەو هەڵچوونی شەپۆل لە دەست بێ دادی گریام و بەر هەنسکی مردنم دا / لە پەنای تاریکی دەیجووری شەوەکانی بێ وەفایی ئیلهامدا - و بە بەرچاوی کتێبەکانی - مەلیکیادیسەوە - لە میحرابی کونجی - حوجرەی دیوانەکەی - /نالیدا- هۆن هۆن گریام و قووڵپی خوێنم دا-
.. ئیلهام دەیگووت تۆ دەستی - کەرێکت - پێ نابەسترێتەوە -
-دەمگووت مەڕۆ با مانگ هەڵبێ باسی - دۆستۆیڤسکیت- بۆ دەکەم ، قەسیدەیەکی -مەحویم - پێیە بۆنی عەتری لێ دێت تازە لە بەهەشتەوە نووسیویەتی/ لە نێو برینی کتێبە دەستنووسەکانی شعوری -جاحزدا- غەزەلەکانی -سەعدیم -بۆی دەکردە پەلک و دەمگووت شکۆفەی غروری گوڵەکانی جوانی تۆ هێجگار مەزنن کەلەم زمستانە سەختەی منا سەریان دەرهێناوە ، بۆنی عارەقی دەگمەنی سێبەری تەڕی ڕەزێکی نایابت لێ دێت کە بەیانییەکی ماندوو بەعەزرەتەوەیە سەر خەوێکت لێ بشکێنێت / غەزەلێکی -حافز - بە شانازییەوە حەز دەکات / دەستنوێژێک لە جوانیت بگرێت
/ من بە حەسرەتەوە منەت دەبەم قومێک لە ( ئاوی) ڕەوانی زەمزەمەت بخۆمەوە شفای پێ دەگرم / تۆ لە هەموو سەرواى بەیتی شیعرەکانی -نالی- جوانتریت -
فریشتەیەک لە لالەزاری بەهەشتی جەستەی تۆدا ڕاکشاوە هیچ کەنارییەک دڵی نایەت بەخەبەری بهێنێتەوە بڵێ ئەی مانگ هەستە نوێژەکەت ڕۆیی.. تۆ کە پێدەکەنیت سوێسسەن و یاس لە جوانیت تەریق دەبنەوە / مانگ پێی عەیبە لە ڕووتدا هەڵبێ / هیچ باخچەیەک لە ڕووی نایەت لەبەردەم شکۆفەی فەڕشی بەهەری تۆدا خۆی ڕابخات / لە شەونمی بەیانییەکی پایز دەچیت کە خۆرەتاو شەرم لە هەڵهاتنت دەکات /هیچ بەیانییەک لە خۆی ڕانابینێ شان لە شانی جوانیت بدات / تاوسێک لەسەر باخی هەناری لێوەکانت هەڵنیشتووە هیچ بایەک دڵی قەمشی ناکات وورشەی سێبەری ئاوریشمی گەڵاکانت بسڵەمێنێتەوە / بە وورینجەی سرکی هێشووی پووڵەکەییت

/ بڵێت بێ زەحمەت لاچۆ من پایز ناردوومی ئەم باخە بووەرێنم
یوسفێک - بەرێکەوت کەوتۆتە نێو بیری زەمزەمی تۆوە حەز ناکات مانگ پێی بزانێت -
جوانییەکیت لە ڕوخساری مانگی یەک شەوە هەڵاتویت ئاسمان لە تەماشا کردنت تێر نابێت
خۆرەتاوێک لە نیگای گەرمی بەیانیانی تۆوە هەڵدێت و لە تاریکی دڵی ساردو سڕی منا ئاوا دەبێت
من لەم شەوە درێژانەی جەفای زمستانی ساردی تۆ بێزار نابم
با)یەک خوا بۆی کردووەو کەوتۆتە نێو دارستانی عەرعەری تۆوە بەدزییەوە شیلەی هەنگوینی)
جوانیت دەخوات / بۆڵە ترێ و بەیی و هەنارو لیمۆی کاڵی جەستەت دەڕنێت / بە کەس ناڵێت
مانگێکم لە ڕوخساری دەریای ئەو کچەدا دۆزیوەتەوە بزان کێ ڕۆژەکانی خۆی لێرە بزر کردووە
با بێت نایدەمەوە پێی )) / خۆرەتاوێکم لە چارەی فریشتەیی ئاسمانی ئەو کچەدا دۆزیوەتەوە ))
.. بزان چ غەشیمێک نەیزانیوە ساڵەکانی گەنجێتی خۆی لێراکەدا جێهێشتووە
مەهدی ساڵەحێکم - لەبەردەم شەعبێکدا دۆزیوەتەوە گیانی تێدا نەماوە -
بزان چ شارەوانییەک لە بیری چووە بینێژێت
.. ئەتۆ چیت خۆ بەرد نیت دە قسەیەک بکە - ئیلی - گیان پێم بڵێ دەرد .. بڵێ سەگباب -
قەیدی ناکات جەفای تۆ لە گیانم خۆشە من عابیدێکی ملکەچم هەموو خوایەک دەپەرستم
من هیچم ناوێت ئازیز ئەو هەموو ڕۆیشتنە بۆ تۆ بەڵام تەنها یەک جارێک دوای ئەو هەموو کوشتنەم
بە جەفای بێ مروەتی وەرە بۆ تەعزێکەم سەرەخۆشییەک لە بێدەنگی قووڵی ناخم بکە من
!!... تا ئێستاش لە نێو گۆڕی بیرەوەرییەکاندا بیرت دەکەم
ئیلهام - لە نێو ئەو هەموو ووشە جوانانەی خۆشەویستیدا کە هیچ حەدیسێکی نوورانیش حەرامی -
نەکردون لە دووری فرسەخێک ئەسەفی بێوەفاییەوە دەیگووت :- ئەم پیاوە تووشی شیزۆفرینیای
قسە کردن هاتووە / دواجار بێ ڕەحمی لیسا عومری پێ نەهێشتووم / مەرگ سەرێکی باداو گووتی
بیر لە چی دەکەیتەوە وەرە با لە تەنیایی ڕزگارت بکەم / لە چ دەگەڕێی ژیان بۆ خۆی بریتییە
. لە وونکردنی داهاتوو لە نێو تەپ و تۆزی بیرەوەرییەکاندا نادۆززرێتەوە
..گووتم لە تۆ دەگەڕێم .. ئەتۆ لیسای..؟ -
بە ویقارێکی مەزنی عیزرائیلیانەوە کە هەیبەت لە شەرمی دەباری گووتی چ دەکەی لەم -
تاریکاییەدا چاوەڕوانی کەس مەکە تەنیایی دەرگای نییە / حەیف گەنجێتی خۆت بە ئایندەوە خەسار
دەکەیت بە خۆڕایی سەری ئەم هەموو ساڵە دەهێنیتە ژان .. دەبوایە ئەوەندە پەلە نەکەیت بۆ خۆت
لە نێو کتێبەکاندا دانیشیت هەتا ئەجەل خۆی دێت / لە نێو ئەم گۆمە سەوزەی زیندەگیدا بێ هودەیە
. بە دوای خۆتدا بگەڕێیت بەختەوەری لە هیچ کوێیەک دەست ناکەوێت .. هەستە
لە بەردەم تەماشای بێ سوودی ئەم ئاوێنە تەڵخانەدا خەریکی چیت ژیان نییە .. بڕوا بکە لیسا نییە
پیاوێك لێرە ئێواران هەموو جارێک لەسەر ئەم بەردە نوێژەی ژیان تەقوای کتێبێکی یاقووتی -
ئەغریقی دەکرد کە لاپەڕەکانی بە ئایەتی ئاڵتوونی گەورە گەورەی خۆشەویستی نووسرابوون
بەرگەکەی سەدەفی گەرمی ژیان بوو کەس هیچی لێ تێنەدەگەیشت ،تا سەدەکانی ناوەڕاستی
فەرامۆشی بەکوڵ گریا گووتی (( خودایە بۆ لیسات پیشان نەدام )) لە کۆتایی سەدەکانی تەنیاییدا
-: ئینجیلی - لۆقاو ، مەتای - بۆ خاتری جوانی لیسا نووسی و پێشکەشی بێ وەفایی کرد تەنها گووتی
.بە داخەوە لیسا بەکەڵکی تەنیایی نایەت .. ئیتر هیچی تری نەووت -
عەزیەتی تەنیایی خۆت مەدە ژیان تونێڵێکی تاریکە لەهەر کوێیەکەوە پێیدا دەچیت -
سەرێکی لە مردنەوە دەر دەچێت و ئەوسەرەکەی لە تەنیاییەوە دەست پێ دەکات
لێگەڕێ با بە مردن داتبپۆشم .. دەبێ تێ بگەی مردن لە باوەشی فەرامۆشی ئەم گۆڕەدا -
لە ڕاڕایی ژیان خۆشترە لە ناڵیەوە خەریکم بۆت دروست دەکەم .. بێ دەنگی جوانترە لە گلەیی ،
مردن باشترە لەم تەنیاییەی کە بەهیچ خۆشەویستییەک پڕ نابێتەوە .. گیانت تەسلیم بکەو

.. دەستبەرداری دونیایی فانی بە هیچ لیسایەکی تێدا نییە بۆ ئاشنایەتی
... هیچ لیسایەکی تێدا نەبووە بۆ ئاشنایەتی .. هیچ لیسایەکی تێدا نابێ بۆ ئاشنایەتی
لیسا لە ئەسڵا خەڵکی دەریایەو لەگەڵ ئاودا هات بۆ سەردانی تینوێتی -
لە دارستانی کەس و کاری دابڕاو لای دایە قەراغی دونیا .. لای هیندییە سوورەکانی عەقڵی منا
مایەوە / من گۆزەیەکی شکاوی سەردەمی فیرعەونەکان بووم ، قەترەیەک ژیانم تێدا نەمابوو
کە لیسام بینی جارێکی تریش باڵق بووم / کە لیسا لە مەملەکەتی داڵغەی منا پەیدا بوو
هێشتان خۆشەویستی ڕەنگی گوڵی نەگرتبوو / (ئاو) سەری بە هیچ لایەکی ڕۆیشتندا دەرنەدەکرد
دارستان بناغەی مەمکی دەرنەدابوو / سێبەری درەخت نەیدەزانی دانیشتن لەپاڵ خۆشەویستیدا
!!.. یەعنی چی
.. دونیا تازە گاگۆڵکێی دەکرد .. باوکم پیاوێکی کەتەی چوارشانەی - نیاندرتاڵ - بوو
لیسا کە هات چەند جوان بوو .. دڵم مەرایی بۆ دەکرد ، فریا نەکەوتم لەبەردەمیا -
-: گەڵا هەڵوەریوەکانی عومرم کۆوەکەم .. لەسیمای خۆربردووی پیاوەتیم ڕاما
ووتم خەڵکی خۆر ئاوای ئەنفالم ، لەگەڕەکی ستەمی تەریق بوونەوە لەدایک بووم -
لە یەکێک لە ساڵەکانی سەرکۆنەو قات وقڕی خۆشەویستیدا چاوم بە مەرحەمەتی ئاسمانە
شینەکانت هەڵهێناو .. لە یەکێک لە ڕۆژە شوومەکانی میللەتیکدا (( کە لە ژیانیدا هیچ ئاسوودەییەکی
شک نەبردووە بۆ شامی ئێوارەی نەوەکانی )) بە قاچاغی هاتمە نێو باغی عەدەنی بێ ڕەحمیتەوە ،
نازانم لە گەڕەکی دەربەدەری و - ئەسفەلە سافلین - لە دایک بووم .. لە ژێر زەمینە تاریکەکانی
ئەشکەنجەی بێ ویژدانی قامچی و کەلەبچە کردنی زمان وزەخمی توانجی ناڕەواو
.. کاردی بوختانی ناحەقی ئازیزانم کرێچی بێدەنگییەکی قووڵ بووم
..پیاوێک لەم تەنهاییەدا منی چاند بەو ئومێدەی ڕۆژێکی ڕوناکی بۆ بگرم -
لە پشت دیوارەکانی چاوقایمییەوە ناچار بووم تا مردن تەحەمولی قسەی ساردو سووکی
ئەو پیاوە بەستەزمانە بکەم کە هەموو جارێک بە بەرچاوی بەیانییەکی شینەوە شعوری دارکاری
. دەکردم
ژنێکی بەدبەخت ڕۆی کردمە پاڵ دیوارە داڕوخاوەکانی چاوەڕوانی درێژی خۆی -
لە پاڵ تاریکایی شەوەکانی بێ دەسەڵاتی مندا تا بەیانی هۆن هۆن دەگریاو بەدیار بێ ئومێدی
..دەردی شکاوی دڵی خۆیەوە وەنەوزی نەدەداو ئێشکی ئازارێکی سەختی دەچێشت
شەوەهای شەوم لەنێو کەلاوە کۆنەکانی تەنیاییدا بردۆتە سەر -
لەسەر لاپەڕەی ئەم قەسیدەیەی کە تۆ نایخوێنیتەوە بزانی بۆچی گریاوم .. چ چۆلەکەیەی تەریوو
.. لە مەغریبی دارستانی دڵی منەوە هەڵهات و ڕێی نەبردەوە باوان
.. لەبەردەم مەیخانەی چاوە خومارەکانی تۆدا سەرمای نیوەشەوێکی سەخۆش کوشتی
ئەو پیاوەی ئێواران لەسەر کۆڵانی تاریکی داهاتووی مندا تانزیکی بەرەبەیانی مردن ڕاوەستا -
-: وجاخی بۆ ڕۆشن بکەمەوە پێم عەیب بوو دڵی بشکێنم و نەموێرا ئیزنی بدەم بڵێم
بمبەخشە بەتەمای من مەبە ڕۆشنایی مەعازەڵام تێدا نییە .. ئەم هەموو ناوە دووبارە بووەوەی -
-تۆ زۆرن بۆ من لەبەر ناکرێن /شەجەرەی ئەم هەموو نوسخە خوارو خێچەی -ئادەم و حەوا
.. کۆپییان کردووە بەمن هەڵناگیرێت ، تاقەتم نییە کەس بەدوای خۆمدا ڕاکێشم
ڕێی ئەو کۆڵانە بەر بدە با بڕوات .. ئەم ڕەشەبایەی کە لەدەللاقەی ڕوخاوی ژیانەوە دێت -
بە عەقڵی هیچ داناییەک ناگیرێت ..من لە ترساندا هەڵاتووم تا ڕۆژی نەفخی سوور لەم تەنیاییەدا
خۆم دەشارمەوە با دایکم پێم نەزانێت کە من ئەوەندە ترسنۆکم ناوێرم ناوی سیانی خۆم
بە کۆڵی کەسەوە بنێم
بەدەستی خۆم نییە زات ناکەم لە نێو ئەم وەتاغە تاریکەدا کەسێکی تر لەدوای خۆمەوە جێبهێڵم -

به دیار ئەم کوانووە ساردەی ئادەمەوەکە بەئاگری دۆزەخیش گەرم نابێتەوەو
.. دەست خەڕۆیی نێو شەقامە ساردەکانی ژیانی بکەم و تەنیایی غەدری لێ بکات
.. کەسیش لێی مەعلووم نییە دونیا چی وەسەرا دێت
بمبەخشە سەرجەللەی باو باپیرم دەسرمەوە کە ئەوەندە رێ عەزیەتیان کێشابوو -
هاتبوون بۆ نێو ژیان و بە دەستی خاڵی گەڕابوونەوە دواوە ، هیچ سەبوورییەکی ئەوتۆیان پێ نەبوو
-: لەگەڵ دڵی خۆیاندا بیبەنەوەو پیشانی ئەو دونیایی بدەن و بڵێن
ئێمە لەسەر (( کاسی تۆپی پێی جیهانی شەڕە گرینگەکانی -گرین دایزەرمان- کرد -
لە نێو فەسڵە جوانەکانی بەهاردا تەماشای شەڕەگاکانی - ئیسپانیامان - دەکرد و -
((... عەقڵی خۆمان بە هێزی -مانگا- تاقی دەکردەوە
ئەوەی - ئادەم و حەوا - بینوویانە هەر ئەوەیە کە تۆ دەیبینیت بەزایەری هیچ شتێکی تازە -
.. ڕووی نەداوە
.. تا ئێستاش جەنگ لە نێو پێخەفە ساردەکانی دڵماندا میز دەکاتە ژێر خۆی -
.. هابیل و قابیل - لەسەر گوولە شووشەیەکی بچووک ئاسەواری دونیا دەبڕنەوە -
... دوو پەپوولە لەسەر تۆزقاڵێک ڕۆشنایی چاوی یەکتری دەردەکەن -
!!.. دوو هەنگ لەسەر گوڵە مێخەکێک حەفتەیەک بەیەکەوە قسە ناکەن -
.. لە نێو ئەم تەنیاییە تاریکەدا هیچ بەیانییەک نایەت دڵی پێ خۆش بکەیت
.ئیتر تۆ بە تەمای چیت ، بۆ لێراکەدا ڕاوەستاوی ، چاوەڕێی چی ی لە ئایندەیەکی چڵمن دەکەیت ؟ -
لە نێو ئەم بیشەڵانە تاریکەدا بەدیار ڕەونەقی قسەی حیزی شکۆفەی گوڵێکی نەفامەوە
بۆ خۆت خەریک دەکەیت ..!؟
(من چیم داوە لە هاژەی ( با) و گڤڤەی چڕی دارستان و بۆڵە بۆڵی ڕۆیشتنی ( ئاو -
کتێبەکان با بۆخۆیان بڵێن .. ژیان ئەوە نییە کە لەنێو دەفتەر ڕەسمەکانی منالێدا بانگی دەکردینە
-: دەرەوەو دەیگووت -ئازاد- وەرە بابە خورماڵووی بۆ هێناوین
... ئەوە سێوێک و -
... ئەوە دوو سێو و -
ئەوە سێ سێو ...بەسە بەسە ئیدی نامەوێت ، ئەم سێوانە زۆرن و بەشی ڕەونەقی -
هەموو جوانییەکی ژیان دەکەن .. نەخێر ئەگەر هەموو زەویش بەتەنیا بدەیتە - قابیل- هەر دەڵێت
بەشم ناکات و ئاسمانیشم پێ دەوێت ئەی من بەهای گەرمیی ژیان و ڕوناکایی جوانی دڵ
. لە کوێدا بکوژم ..؟؟؟
پیاوێکی عەسەبی لە نێو کۆڵانە تەنگەبەرەکانی چارەنووسمدا کە هیچ ڕێگایەکی تێدا نەبوو -
. بۆ دەرباز بوون لە دڵڕەقی بەر دەرگاکانی تەنهایی لێگرتم
-چ جارێک کە تووڕە دەبوو من قیبلەم لێ دەگۆڕاو شایەتوومانم بەسەر شانی - ئیبلیسدا -
.. دەهێناو وام دەزانی خولەفای ڕاشدین بریتین لە دوو کەس و بە باوکمەوە دەبێت بە سێیان
ڕۆژەکانی حەفتە لە ماڵماندا میزیان دەکرد بە خۆیاندا .دایکم وەک ژیژک دەچووەوە سەر یەک و
.. دەبووە پارچەیەک خامی سپی .. ئاسمان ڕەنگی زەردی زەعفەرانی و لیمۆیی دەگرت
-: چ عانێک دایکمی فەلاقە بکردایە بە قژ ڕایدەکێشا بۆ نێو بیرەوەرییە تاڵەکانی من و دەیگووت -
((.. عەمرت نەمێنێ بۆ خۆت و کوڕێک کە هاوردووتە))
دایکم هەرگیز نەیدەزانی پێکەنین بۆچی باشەو بێدەنگی چ دەردێک دەرمان دەکات -
تەنها دەیتوانی لەسەر بەرماڵی ئێواران دۆعای شەڕی لە زۆرداری بکردایە کە خوشکەکانمی
!!..بە نابالقی دابەشوو
هاوڕێکانم هەڵاتن بەرەو ئاینده من لە نێو بیرەوەرییەکاندا تەقەی سەرم دێت -

لیسا بەسەبری - ئەیوبێکی - شەرمنەوە لەسەر بەردە نوێژی شینایی عابیدێکی بەساڵا چووم -
.. سەرم لەسەر بەرماڵی سوجدەت هەڵناگرم تەقوای هەموو بێ ڕەحمییەکت دەکەم
لە پشت دیوارە سەختەکانی تەنیاییەوە زۆر دانیشتووم هیچ کتێبێک تێم نەگەیشت -
بەدەم ساڵە درێژەکانی دەست خەڕۆییمەوە لە تەمەنی گەنجێتی جێمام
!!.. لە هەموو سپێدەیەکی ئاسوودەیی خۆشگوزەرانی دواکەوتم .. ئەتۆ چ ساڵێکیت لیسا
ئەمن بەجەفای ئێشی سەختی خۆمەوە لە نێو ئەم ساڵانەی بێدەنگی درێژی تۆدا دەمرم -
ئەتۆ فەسڵێکی سەخیت لە جوانی بەشی داڵغەیەک تەماشام بکە .. بەشی شانازییەکی کەم -
بەقەدەر دەنکە زەنگیانەیەکی شین لەسەر یەکێک لە فەرعەکانی ڕۆیشتنت
... ئاوڕێکی بچووکم لێ بدەرەوە دڵنیابە خوایش پێی خۆشە
(( کە دەگەم بە لیسا - A-B-c-d م لەبیر دەچێتەوەو تەنیاییم کەڵکی ئەوەی نەماوە ((
.. جارێکی تر بیخەمەوە بەر ئەلفابێتای دڵداری
لیسا من تووشی نەخۆشی ڕەبەنی هاتووم حەز دەکەم لە درۆیەکی -نیساندا - پێم بڵێی خۆشم دەوێی -
ئەتۆ چ ڕۆژێکیت لیسا .. لای ئێمە حەفتە بریتییە لە یەک ڕۆژ و هەموویشمان وەک و یەک -
-: .. دووبارەی دەکەینەوە
بێ ئیشی لە ووڵاتەکەی مندا بەیانیان درەنگ لە خەو هەڵدەستێت -
.. نیگەرانی هەموو ڕۆژەکانی حەفتەی فێری جگەرە کێشان کردووە -
.. دەستبەتاڵی ڕۆژ تا ئێوارە لە چایخانەکاندا تەقەی دۆمینەی دێت -
چاو چنۆکی شیر براکانم هەمیشە سەریان لە شەڕ دەخورێ و ناموسی جوانی نیشتمانەکەمیان
ئەتک کرد . بە کوشتنی دڵی هیچ یەکێک لە ڕۆژەکانی حەفتە تێر نەبوون ساڵەکانی داهاتووشیان
.. تیرۆر کردین
پیاسەی دووری کچەکانمان لە بەر قاپی ئێواران زیاتر تێناپەڕێ و هەمیشە لە درزی -
تەنیاییەکی دوولاییەوە سەیری ڕۆژە تێپەڕیوەکانی ساڵ دەکەن کە لەوسەری کۆلانەوە
.. فیشکەی جگەرەی دێت
.. من لە قوتابخانە جەنگ دەرسی پێ ئەوتمەوە بەڵام فێری توڕەیی نەبووم -
هەڵگەڕیم لەسەر شەقامە چاوشۆڕەکانی بەرەڵایی و چەتوونیم لە نێو کۆڵانە تاریکەکانی تەنیاییدا
!!.. فێری درۆی نەکردووم باوەڕم پێ بکە خۆشم دەوێی
لیسا عاجباتی لە ئەتواری تەنیایی درێژ داداڕی من دێت کەچی خامۆشیم ئەوەندە شەرمنە -
.. لە ڕووی نایەت قسەیەک بکات
لە ئاست هەیبەتی بەژنی باڵای لیسادا قەڵەم دادەرێکم پێ نییە بێدەنگی خۆمی پێ دابدەم -
لەبەردەم نیشانە چەماوەکانی پرسیاری دادگای عوروفیی لیسادا گۆمێکی قەوزە گرتووی مەندم -
بێجگە لە بیرەوەری هیچ بوونەوەرێکی ترم تێدا ناژی / تەنهاییەکی تواوەی بەر گەرمای هاوینم
باڵندەیەکی بێ پەناو پەسێوی ژێر سێبەری تەڕی بارانم / لە نێو کەوانە گرژەکانی برۆی لیسادا
.. تەنیاییەکی داڕزیوی دەست بەسەرم هەموو ئێسقانەکانی نیگەرانیم بەدەرەوەیە
. لەو پەڕی دونیاوە تەماشام بکەی تێدەگەی چ عاشقێکی زەلیلم -
بەدەست مەغۆلییەکی شیرازییەوە چ - حافزێکی - داگیرکراوم -
غەریبییەکی تۆز لەسەر نیشتووی سەدەکانی ناوەڕاستم و بۆنی ڕۆمانسییەتی -شیللیم - لێ دێت
بێدەنگییەکی بێ شوناسم و ناتوانم لە سنوورە سەختەکانی جوانی لیساوە کە بە بێ وەفایی داخراوە
بپەڕێمەوە بۆ نێو زیندگی
-: .. دیلێکی بەدبەختی جیهانی یەکەمم سەرلەنوێ دادگایی دەکرێمەوە -
تۆ بۆنی چ بیرەوەرییەکی بێ تامت لێ دێت .. دەم و چاوت ڕەنگی قەوزەی چ عوزلەتێکی )) -

!!.. ناشرینی هەڵگرتووە / ئەم کەئابەتە چڵکنەت ڕوخساری ئادەمی پێوە نەهێشتووی
لەبەردەم قازی کەزییە جوانەکانی لیسادا کە وەک و ماینی یەکە ناس سەر ڕادەوەشێنێت -
بەرگریم لە چارەنووسی شوومی خۆم پێ ناکرێت .. (( هەناسەم بۆنی دەنگی دانووساوی شەڕی
/ گەرمی برا کوژی لێ دێت / بۆنی دەنگی قرخی تەعدای باررووتی کورد کوژەکانم لێ دێت
بۆنی خوێنی تەڕی ئەنفال و دووکەڵی چڕی کیمیاباران و عارەقی ترشاوی کۆڕەو
. ((!!.. لە بن باڵم هەڵدەستێت
لیسا قەڵس دەبێت ماچی بکەم دەڵێ :- (( دەمت شێی تەڕی زیندانی کردنی ووشەی ناو -
ڕۆژنامە کۆنەکانی پێوەیە / دڵت بۆنی تاریکایی ساردی ڕەبەنییەکی لێ دێت کە بەحەیاتی ڕۆشنایی
گەرمی جەستەی نەدیبێت / بۆنی تەنیاییەکی بە جێماوی ناو سەدە کۆنەکانی فەرامۆشیت لێ
هەڵدەستێت / ڕەنگی ووشەو قسەی زل و بێ مەعنای ناو کتێبەکانت گرتووە / سیمات باوێشکی
ماندووی عاقیبەتی پیرێتییەکی ئاخر شەڕ دەدات / لە چوار چێوەی مانگی خەزەڵوەری ئاوێنەی
جوانی لیسادا ڕێزەی تاڵ و ناشرینی ڕۆژ هەڵاتییەکی بەد فەساڵم / قسەی بەجێماوی نێو دڵی
-: زیندانییەکی هەرزەکارم کە لە نێو چوار دیواری زیندانە قەدیمەکانی فەرامۆشیدا دەنووسێت
لیسام خۆش دەوێت .. !! )) . 2000 - بۆ یادگاری لە ساڵی
مامە حەمەیی دونیا بۆ هەموو شەقامە داگیر گەرەکانی - ئینگلتەرا - دەکەم هەر پارکێک -
سۆراخێکی دڵی لیسا پێ دەزانێت لە بەر خاتری مافی مرۆڤ پێم بڵێت / لە ژێر پەرەی هەوریشدا بێ
دەڕۆم تۆزێک هەتوان بۆ سەر برینی دڵی کوڕە کەچەڵەیەکی عاشق دێنم / دەچم لە دوورایی دەشتی
خوداوە تەماشای سیحری ئەو مەملەکەتە دەکەم کە کتێبە پیرۆزەکان ناویان لێ ناوە لیساو
حاجییەکان ڕۆژی عارفات سەریان لێ هەڵدەسوون / تۆزێک لەم تەنیاییە درز تێکەوتووەوە لە
/ بۆشایی عەقڵی خۆمەوە بەدزی شەرمەکانی مناڵیمەوە بەشی داڵغەیەکی شین تەماشای دەکەم
کەمێک سەیری پەلکە زێرینەی ئاسمانەکانی لیسا دەکەم هیچ نابێ با تێبگەم بزینم ئەستێرەی
بەختی من لە کوێدا دەخەوێ و کێ حەبی خەوی دەداتێ .. / چ عەجوولیەک دەستی نەوەستاو
قیبلەی - موحەمەدی - گۆڕی و من باشورو باکوری خۆمم لێ تێک چووە / ڕۆژ لە هەڵاتن دوو دڵەو
ئاو) لە ڕۆیشتن پەشیمانەو / ( با) فێر بووە پێش ئەوەی بچێت بۆ دارستان خۆی دەکات)
بە نێو مەیخانەکاندا و نیوەشەو ساقییەکان بە پاڵ دەری دەکەنە دەشتەوە / ئاسۆی ژیان
ئەوەندە لێڵ بووە بەیانیان بەشەقیش خەبەری نابێتەوە / ڕۆژەکانی حەفتە کە دێن هێشتان خەوی
نەگبەتی بەری نەداون پێیان لەسەر و سەکوتی چارەنووسی من دەئەنگووتێ و داهاتووم دەرژێننەوە
سەر سەفر
بەیانیان کە هەڵدێت لە بیری نییە زنجیری پانتۆڵەکەی دابخات ڕۆژەکانی حەفتە پێی پێ دەکەنن -
چوار شەممان زەینی تێک چووەو بەدەم ڕێکردنەوە ئاگای لەخۆی نییە قسە دەکات -
. لیسا کە لێی دەپرسێت تۆ چ ڕۆژێکیت لێی تێک دەچێ و دەڵێ من ناوم پێنج شەممەیە
/ لیسا هەموو بەیانییەک زوو ژیان لە خەو هەڵدەستێنێ و مەعنایەکی گەورەی پێ دەبەخشێ -
/ ئیزنی ئەستێرەکان دەدات ئاوابن / بە خۆرەتاو ئەڵێ درەنگە خۆت بگۆڕەو هەڵبێ
ڕوخسەتی ئاو دەدات بڕوات بۆ قوتانخانە / بەوەرزەکانی ژیان دەڵێت بڕۆن بۆ میوانی ساڵی تازە و
بەڵام یەکی لە سێ مانگ زیاترتان پێ نەچێت/ بە یەکشەممە ئەڵێ ئەمڕۆ تۆ لە ماڵا دانیشە
ئیسراحەت بکە / بە گەردەلوول ئەڵێ تۆ زۆر چڵکنیت بڕۆ خۆت بشۆرە / بە تووڕەیی ئەڵێ عاقڵ بە شەڕ
/ مەکە
بە باران دەڵێ تۆ مەشروب زۆر دەخۆیتەوە و سەرما گلەیت لێ دەست دەکات / بە (با) دەڵێ
تۆ زۆر هەڵەگەڕی و ڕوو لەماڵی خۆمان ناکەیت / بە تاریکی دەڵێ لەبەردەم کۆڵانەکانی دڵتەنگی
ئێوارەاندا ڕامەوەستە عەیبە دراوسێکان پێیان ناخۆشە / بە مانگی نیسان دەڵێ تۆ فێری درۆ کردن

!! .... بوویته / به من دەڵێ تۆ بمره به کەڵکی ژیان نایەیت
لیسا که تەشریف دەهێنێت خۆرەتاو سەر دادەخات تا له حوکمی چاو ڕەت دەبێت -
که دێت هەڵمی گەرمی چایی بەیانیانی لێ هەڵدەستێ (( بەختەوەری به ڕوویەکی خۆشەوه -
(( ! لەسەر سفرەی ئاسوودەیی بەرچایی دەکات و ژیان بەنازەوه دەڵێت بەیانیت باش
که دێت بۆنی عەتری حەیزی مێینایەتی تەڕی بەهاری لێ دەچۆڕێ (( هەموو پرشنگی جوانییەک -
(( زەیستانەو خۆشەویستی کچێکی جوانی دەبێت و ناوی لێ دەنێن ژیان به کوردی یەعنی لیسا
که دێت هەموو شینایی ئاسمانی داوەته پێش خۆیی و وەرزەکانی ساڵیش له گەڵیا دێن و -
مانگ و خۆر به ئەدەبەوه له پشتییەوه ڕادەوەستن .. سروشت ڕێنوێنی دەکات ، سەراپا
.. زەردەخەنەیەکی ئاودامانی هەناری له کەزییەکانییەوه شۆڕ دەبنەوه بۆ سەر زەوی
که نایەت ڕۆژەکانی حەفتەیش نایەن ، ئاینده واز له مەکتەب دەهێنێ و -
. زەویش تاقەتی نییه به تەنیا بسوڕێتەوه
لیسا من له غەیبەوه خۆشم دەوێی ، تۆ له هەموو ڕۆژەکانی شەمەو یەکشەمەو دووشەمه جوانتریت -
بەقەدەر هەموو ڕۆژەکانی سێ شەمەو چوار شەمەو پێنجشەمەو هەینیش حەزم لێته
لیسا ڕەنگی قەرسیلی تۆخی فەلسەفه لەبەر دەکات / به لوغزی کەون چاوی دەڕێژێ و -
قژەکەی له دواوه به نهێنی سروشت دەبەستێت و / له حەوت تەبەقەی ئاسمان دادەنیشێ و
به زمانی باڵندەیش قسان دەکات و من هیچی لێ حاڵی نابم / ئەویش سەری له کتێبی
سەیرو سەمەرەی عەقڵی لادێی من دەرناچێت که نازانم بڕۆم بۆ شار له نێو قەرەباڵغی جوانی لیسادا
وێڵ دەبم / نازانم چۆن سواری -ئەلەڤەیتەیەک -بم تا بگەمه نهۆمی سەد قاتی بینینێکی لیسا
که هیچ ڕۆژێکیش مواجەی نییه ، دواییش هەر نازانم به چ کۆڵانێکی نازانمدا بگەڕێمەوه بۆ لای
.!! .. پەشیمانی ساردی تەنیایی ڕووشکاوی خۆم
لیسا لەبەردەم سەرنجی تکای زەلیلی چاوه شۆڕەکانی منا سەری نیشانه حیزەکانی سەرسوڕمان -
دادەخات و دەڵێ (( چ بایەکی قەشمەر داویتێ پێش خۆشخەیاڵی خۆی و هێناویتی بۆ بەردەم
/ تەونی جاڵجاڵۆکەی پرسیاره ساردەکانی سۆراخی من که له عەزەڵەوه وەڵامیان نییه
چ لافاوێکی سیاسی هەڵیخەڵەتاندی و له کەنارەکانی کەم عەقڵییەوه هەڵیگرتی خستوتێ نێو
!!.. کۆردەرەی ئەم پەشیمانییەی که ڕێگای هیچ گەڕانەوەیەکی تێدا نییه به دەرباز بوون له تەنیایی
له ووشکانی چ داڵغەیەکی شوومەوه هاتیته ئەمبەری ( ئاو) و ، چۆن له بیابانەوه ڕێت دەرکرد -
-: چ کتێبێک دەستی گرتیت
،... له نێو چیرۆکەکانی - دۆستۆیڤسکییەوه - هاتم لیسا -
دوای لافاوەکەی - نوح- من و دایکم بەتەنیا لەسەر عەرزا ماینەوه .. زاوزێمان نەدەکرد -
/ من مەیتەرەوانی بێدەنگییەکی کوشنده بووم ، فەرامۆشی زەلیلی کردبووم
دایکم لەبەردەم جەفای بێ ڕەحمی ئاوێنەکانی ژیاندا شەرمی له ڕووتی هەردووکمان دەکرد
.. که به تەنیا له نێو بیرەوەریەکاندا مابووینەوه ، بێ کەسی ئاوی چاوی ژەندبووین
(( دەیگووت (( کوڕم بەتەنیا ئیداره ناکەین ژنێک بێره ئەم چاوەڕوانییه خوا ناناسێ قاتڵه ئەمانکوژێ -
دایکم له گەڕەکی ژیان باری کرد و من بەرگەی ئەو تەنیاییه قاتڵەم نەگرت ،
له نێو ئەفسانەکانەوه هەڵاتم ... به نێو تارمایی بیرەوەری سەختی ووڵاتەکەمدا هاتم
بۆ بەردەم ئاستانەی ئاسمانەکانی دیدەی تۆ ئیکلامی کۆیلەیەتیم کێشاو
..دەستی گەداییم ماچ کرد
وەختێک مانگ له ڕوخساری تۆدا خەرمانەی دا -
.. من به دزییەوه له نێو دارەکانی قەراغ تەنیایی ئێوارانی کەساسی میللەتەکەمەوه هاتم
له پشت شەوانی دەیجووری ئاوایی بێ سروەو بێ نازی کچەکانمانەوه هاتم

که دەنگی حەپەی هاتنی هیچ ئومێدێک شک نابەن لە نزیک تاریکایی دڵی خۆیانەوە
بە ژێر سێبەری کەپری چاوەڕوانی دوور و درێژی ئەو دار هەنارە عازەبانەوە هاتووم
کە هەنجیری لێویان لە تەنیایدا قەدماغەی بەستووەو گەڵا مێوەکانی ڕوومەتیان لە سوێی تینوێتی ماچێکدا زەرد داگەڕاون
لە نێو شەڕە چەقۆی ئەو جەللادانەوە هەڵاتم کە قەسابی نیشتمانەکەم دەکەن و -
بچووکترین سوعبەتیان کوشتنی جوانییە لە زەردەپەڕی ئێوارەداو
یاساغی کردنی سنووری ئازادی ڕۆیشتنی( ئاوە ) بە نێو بۆنی دارستانداو
بە (با) دەڵێن لێرەوە هات وچۆ مەکە ( شەرع) ڕێنادات ،
/ بە بێ دەنگی نیشتمانەکەم دەڵێن خۆت پۆشتە بکە /باران بەڕووتی نەگەڕێ و -
.. هەتاو بەسەرپۆشەوە هەڵبێت
دە ساڵ بەهاریان لە (ئاکرێدا) حەپس کرد هەموو فەسڵەکان بوون بە کەفیلی بەریان نەدا -
- دە ساڵ شینایی ئاسمانیان لە ( قەڵاچۆلاندا) بێ سەرو شوێن کرد و -
کەس نەیوێرا لە شمشێری هەوەسی ئەو پیاوانە بپرسێ بۆ مانگ دەکوژن ، ئەم ئەستێرانە بەم ئاخری تەمەنەوە بۆ کوێ بڕۆن / ئەم درەختە دەست و پێ سپییانە بە چی بژین .. ئاخر ئەم کۆڵانانە خۆ -مار- نین
. خۆڵ بخۆن .... ؟؟؟
.... خوا دەیزانێ ، مەعلووم نییە لە کوێوە هاتووم -
ئەجەل منی هێناوە لیسا گیان بۆ ئەوەی تۆ ڕوحم بکێشیت چوونکە -عیزرائیل - خۆی تاقەتی -
نەبوو / دڵی من کتێبێکی دەستنووسی مسماری یاساغەو هیچ دەزگایەکی میهرەبانی بۆی چاپ
نەکردووم ، لە پەنا دیوارەکانی ترس و شەرم و ڕاوەدوونان و ئیعدام و تێهەڵدان و لە نێو باوڵە کۆنی
-: بیرەوەرییەکانی دایمدا شاردوومەتەوە ناوێرم بۆ هەموو کەسێکی دەر بێنم
بۆچی تێم ناگەی لیسا گیان کوردی نازانیت ..؟ -
- .... نەءء -
!!.. موعاناتەکانی من کوردین و وەرناگێڕرێتە سەر هیچ زمانێکی دیکەی ئاسوودەیی -
نازانم ووڵاتەکەم دەکەوێتە چ سەمتێکی نەگبەتییەوە وەلێ خەڵکی ئەو جێگایەم کە بەبەر چاوی -
.. یەکشەمەیەکی پەمەییەوە دەتکوژن و دووشەمەیەکی نارنجی خۆی تێناگەیەنێت
بە بەر چاوی هەزاران قسەی لووسی ئاڵتوونییەوە زمانت دەبڕن و هیچ شەقامێک ناڵێت -
.. ئاخر ئەم شۆستەیە گوناحی چییە تا مردن قسە نەکات
لە بەردەم ڕەونەقی قەدری جوانی ژیاندا هەموو ڕۆژێک مەسیحێکی شعورت لە خاچ دەدەن و -
..حورمەتی پێغەمبەرانەت دەشکێنن هیچ خودایەک خۆی لەو مەسەلانە هەڵناقورتێنێت
-: لیسا پێکەنینی بەو چیرۆکە خورافییانە دێت کە من دەهێنێتە گریان .. دەڵێ -
ئەم گوێزانەی تۆ دەیان شکێنیت هیچیان ناوکیان نییە ئەدی چۆن بەرگەی ئەو هەموو -
تەنیاییەت گرت .؟؟
کوا بەرگەم گرتووە لیسا .. ئەوە نییە مشتێک ڕەژووی بێدەنگییەکی عەدەم کراوم -
کە بای بێ ڕەحمی هەر جاری بۆ لایەکم دەبات و هەر ڕۆژی لە دەرو دەوری ئاوارەییەکدا
!!.. وەک و دووشەش لێی کەوتووم
لیسا لە نێو ئۆقیانووسی تەنیایی بێ بنی مندا وەک و ماسییەکی خرپن سەر بادەدات و -
.. لەو تاریکاییە دەیجوورەی ناخم دەسڵەمێتەوە کە بای وەشت دەیشڵەقێنێ
!!.. دڵم لە مەنفەزی ڕۆشناییەک دەگەڕێ لیسا سەرمامە ماڵی میهرەبانی لە کوێیە -
!!.. ڕوحم لە سوکنایی ئارامییەک دەپرسێ لیسا نەخۆشم بیمارستانی عیشق لە کوێیە -
چاو بۆ حەنانەتی مەرحەبایەکی گەرمی جارانی کۆنە درەختێکی ناو دارستانی بیرەوەرییەکانم دەگێڕم -

!!.. مەسکەنی ئارامگەی جانان لە کوێیە
هەناسەم لە بۆنی خۆشی قسەی گەرمی ئاشنایەتییەک دەگەڕێ کە تامی نانی گەرمی دەستی -
.. دایکم بدات . خودایە تۆ چەند بێ وەفای نازانی دایکم چەند تۆی خۆش دەویست
..نە دەبوو مردن بەر بدەیتە گیانی نەرمایی لێرەوارو تەڕایی گیاکان بسووتێنێ -
ڕووناکایی لە مانگ بستێنێتەوەو نەتوانێت لە بەر پێی تاریکایی شەوێکدا هەڵبێت -
بەیانییەکی پێ بدۆزێتەوە کە لە عەزەڵەوە وونی کردووە /بۆنی گەرمایی و سێبەری فێنکی ئێواران
..لە نێو دڵی دارستانێکی تەنیا باڵدا بکوژێ و ئاو لە ڕۆیشتندا دەستخەڕۆ بکات
تریفەی پیاسەیەکی دوو قۆڵی عەسر لە زەردەپەڕی تەنیایی ئێواراندا جێ بهێڵێ ومانگ لە هەڵاتن
.. بێ ئومێد بکات
گوڵێک لە نێو ئینجانەی شکاوی باخچەیەکدا سەری خۆی کز کردووە و بێوەی دانیشتووە -
بە مردن بڵێ چی گەرەکە بۆ سەوزایی بەهار دەڕنێ .؟..ئێمە ئەم سێوە لاسوورەی ژیانمان
بۆ جوانی بەم دارەوە هێشتووەتەوە بە مردن بڵێ بۆ دەیخوات / خودایە من گەردنی تۆ ئازاد ناکەم
ئاخر تۆ منت لەم تەنهاییەدا بەدیار چییەوە دروست کرد .. تۆ کە مادام هەموو ڕێگاکانت داخست
ئیتر بۆ چی ڕۆیشتنت پێ بەخشین / تۆ کە مەسکەنێکت نییە لە لە ئارامی ببەخشی بە سەبووری دڵی
تەنهایی ئێمەو سیمای نیگەرانی تەڵخی ڕۆژەکانمان کە لە پشتی هیچ ئایندەیەکەوە هەڵنایەت
ئیتر بۆچی بەهارت دروست کرد / تۆ کە مەعنایەکی گەرمت نییە ببەخشیتە سیمای کاڵبوونەوەی
ڕەنگی تۆخی وەفاداری و / پەژمووردەیی باخچەیەکی تینوو لە سوێی جریوەی باڵندەو
ئێوارەیەکی نەخۆش لە نێو پێخەفی ساردی کەساسی و / مردنی باڵندەیەکی پیر لە دارستانێکی
تاریکدا / ئیتر ڕۆیشتنی (ئاو) بە کەڵکی چی دێت / ئیتر تۆ موعجیزەکانت بۆ کەی هەڵدەگریت
من تەنیایی خەریکە ئەم کوژێت / مادام کە قەفەس هەیە فڕین هیچ مەعنایەکی نامێنێت
خەتێک بێنە بە ژێر بێدەنگی منداو ئەو هەڵانە بکوژێنەوە کە منی لە کونجی ئەم تەنهاییەدا -
دروست کرد / ئەم دەفتەر ڕەسمانە هیچ حیکمەتێکیان تێدا نییە بۆ فێر بوون / - دارا- تەنها
لە دوورەوە دوو داری بینی ، من لە نزیکی هیچ ئاشنایەتیەکەوە گەرماییەک شک نابەم بۆ سەبووری
دڵم، ئیتر ئەم هەموو عومرە بۆ خۆی زیادە ، ئەم هەموو ژیانە ئیسرافە لە چاوەڕوانی پیاڵەیەکدا
کە خاڵییە لە شەرابی ئاسوودەیی
بە ڕەسمەکەی - دۆستۆیڤسکی - گووتم وەرە دابەزە با دوو قسە بکەین
.. ئەم بیرەوەرییانە دەمکوژن - ئەمارانتا - هەڵبستەوە لە مردن ئاخر من تەنهام تەنها
بە تاریکایی ئێوارەیەکی خامۆشم گووت من غەریبییەکی ساردی تۆز لەسەر نیشتووی جادەکانی -
دەربەدەریم تەنیایی لە خاچی داوم / من هیچ کەسێکی تر ناناسم بێجگە لە تۆ خەریکم
لەم فەرامۆشییەدا سوێم دەبێتەوەو دەمرم تەنها یەک جار لە دواوە بانگێکم بکە با دڵنیا بم
.. ( کە ناوم ( مەهدییە
دواجار نامەیەکم نووسی بۆ -عیزرائیل - و گووتم برام تۆ خەریکی چیت من زۆر تەنهام بۆ نایەیت -
سەرێکم لێ بدەیت ژیان دەردی من تیمار ناکات ...؟.. کەس بە ئێشی سەختی ئەم برینانەوە تێم
.. ناگات نا .. کەس بەم ڕوخسارە حەزینەوە نامناسێت
. بە - کافکا - بڵێ : تۆ چاکت کرد مردیت .. ژیان بە کەڵکی تەنیایی نایەت
لیسا لەم گوناحانە بمبەخشە کە ئەوەندە خۆشم دەوێیت و زەمی بێ وەفایت دەکەم / خۆشەویستی -
دوا بەخششی هەتاوە بەر لە ئاوابوون کە بەشەو دەڵێ هانێ ئەو تیشکانەی زەردەپەڕیش بەرە
ئیحتیاجیت پێی دەبێت / دابەزینی وەحی ئاوە لە غەیبەوە بۆ تینوێتی / بانگ کردنی ئێوارەیەکی
تاریکە لە دواوە کە دەگەڕێتەوە بەرەو تەنیایی ناخی ساردی خۆی پێی دەڵێی دوێنێ(( کاک
.. نیوەڕۆم بینی سەلامی لێ ئەکردیت و ئەم زەرفەیشی دامێ بۆ تۆ هەندێک خۆشەویستی تێدایە

گووتیشی بەیانی سەری لێ ئەدەم )) ... دوا وەسێتی گەڵایە بۆ دارستان دەڵێ پێش ئەوەی لەم
پایزەدا هەڵوەرێم وەرە هەموو بیرەوەرییەکانم بەرە بۆ خۆت وەرە دڵمت بدەمێ بۆ یادگاری
.. بۆ ڕۆژە ساردەکانی پیری لە نێو پێخەفی ساردی مردندا بە کەڵکی تەنهایت دێت
خۆشەویستی ئەو پەڕی گەورەیی مرۆڤە لەسەر عەرشی پێغەمبەرایەتی / ئەوپەڕی بەخششی بەهارە
لە سەوزایی بێ درێغی خۆی کە دەڵێ بە کەیفی خۆت دەست لەم جوانییەم دابگرە پێش ئەوەی مردن
خۆی بکات بە ماڵا و بڵێ درەنگە خۆت کۆوەکە دەتبەم بەرەو تاریکایی نەمان ، دەتبەم بۆ شوێنێکی
دوور ئیتر تەواو ڕەنگی باخچە نابینی ، گوێت لە ترپەی گەرمایی هەناسەی ماچێکی مزر نابێت ، دەتبەم
بۆ جێگایەک ئیتر ناتوانی بگەڕێیتەوە بۆ نێو ئارامی دڵێک کە خۆشی بوێیت .. بخۆ بە کەیفی خۆت
سێبەر بخۆ .. تێر خۆت هەڵبکێشە لە ڕۆشنایی .. بە ئارەزووی خۆت هەنجیر بچنەو ڕەنگی هەنار
کۆوەکە با پێت بێت بۆ خۆشەویستی .. هەتا ئەتوانی بۆنی باخچەو قسەی خۆشی دڵداری و
نەسیمی عیشق و بۆنی ماستی تەڕی بەیانیانی خۆشەویستی هەڵگرە لەگەڵ خۆت
با ئیحتیاجیت نەکەوێتە تەنیایی..ئەمە قسەی ئاوە لەسەرە مەرگی ووشک کردندا
. خواوەند بۆ پێغەمبەرەکانی گێڕاوەتەوەو من لە کتێبەکاندا گوێم لێ بووەو دایکم لە خەویا بینوویەتی
من هیچی تر نازانم لیسا گیان کابرایەکی غەشیمم کتێبەکان ئەم پەنەیان پێ داوم -
-خەتای - دۆستۆیڤسکی - بوو فیتی دام و خستومێ سەر کەڵکەڵەی ئەم ڕۆیشتنەی -نالی
بەرەو ئەو مەملەکەتە شوومەی کە ماڵی حەبیبەی لێیەو سەرئەنجام لە کۆڵانی بێ وەفاییەوە
- دەر دەچێت .. چی بکەم خوا کتێبەکان بگرێت .. خوا دۆستۆیڤسکی بگرێت .. ماڵی -نالیم
.. بەقوڕ گرت ئەوەندە وەسفی زوڵفی خاوی تۆی کردووە - جاحزیشی- لە ڕێ دەرکرد
لیسا ڕاستی خەتای کەس نییە دڵم حەزی لێتە بەیانییەکی نەفامم تازە عەقڵم بڕیوەتی و -
ناوی خۆمم لە سەر دیوارەکانی دڵڕەقی حەوشەی دڵت نووسیوە ئەم جارە ڕەشم مەکەرەوە
کەنارییەک نەیزانیوە ژیان قەدەغەیە لە سێبەری سەرووی باڵات هەڵنیشتووە .. هەڵی مەفرێنە -
کانییەک دڵی بە خۆی خۆشەو لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەڵێت بۆ پێی دەڵێیت دەنگت ناخۆشە -
چوارشەمەیەکی هەرزەکار لەبەردەم کۆڵانی جەستەت ڕاوەستاوە هیچی نەکردووە -
تەنها تەماشای هێشووی جوانیت دەکات بۆ دەڵێی لێرەوە هات وچۆ مەکە گاڵی ڕۆژەکانی حەفتەت
.. لێ دەدەم بەشەق بتکوژن
قومرییەک لە زیندانی سەختی قەفەسەوە هەڵاتووەو پەنای هێناوە بۆ بەردەم لێرەواری بەژنی
.. بەهاری سەوزایی تۆ گوناحە مەغبیری مەکە
گەڵایەکی ماندوو لە دوورەوە هاتوە تینوویەتی لە بەردەم کانی نیگات لەسەردەم ڕاکشاوە ئاو -
دەخواتەوە کەس نازانێ خۆشەویستی چ دارستانێک لە زمستانی ساڵێکی سەختدا لە ماڵ
.. دەری کردووە .. گوناحە خێسەی لێ مەکە
پەنجەرەیەکی ژەنگ گرتوو دڵی خۆی بۆ ڕۆژێکی خۆشی هەتاو کردۆتەوە بۆ دایدەخەیت -
مانگێک دڵی بە ژیان خۆشەو لە بەر پەنجەرەی جوانیت هەڵهاتووە بۆ پێی دەڵێی لێراکەدا -
... ڕامەوەستە
با) یەک سۆراخی کردوویت موعجیب بووە بە نەسیمی فێنکی هەناسەت تەنها حەز دەکات ) -
بتناسێت .. بارانێک دڵی سەغڵەتەو بەکوڵ لەبەر دەمتا دەگری .. شەوێک لە درزی یەخەی کراوەی
.. جوانیتەوە حەز دەکات تەماشای هەڵهاتنی بەیانی بکات
لیسا شەوانی میعراج دەڕوات بۆ ئاسمان و هەموو ئارامییەکی دونیا لە پێش چاوی ژیان غەیب -
دەبێت ، هەموو وەرزەکان لە هەتن پەشیمان دەبنەوەو .. باران لە بارین دوودڵەو بەفر داناکات و
ئاسوودەیی ڕەنگی مردن دەگرێت تا لیسا تەشریفی دەهێنێتەوە بۆ نێو وەرزەکانی ساڵ
من سەرم لەوە سوڕ دەمێنێت ئاسمان چۆن بەشی تەماشای ڕەونەقی جوانی لیسا دەکات و -

... تریفەی مانگی ڕوخساری لیسا لە کوێوە وەحی بۆ دائەبەزێ
لیسا دەڵێ عەقڵت لە گەمژەیی گردوەکە بۆ فێر نابێت لە کونجی ئەم تەنیاییەدا بمریت باشترە -
لەم گەڕانە بێ هودەیەی بە نێو کۆڵانەکانی گەدایی عیشقدا کە تازە جیڕەی هیچ دەرگایەک لە ئەتوارە
سەیرەکانی تۆ ناکرێتەوە تا زەکاتی خۆشەویستیت بداتێ ، تۆ سواڵکەرێکی بەد قدوومی لە دەرگای
/ دوولایی بێ سوودی ئەو دڵانە مەدە ڕەنگی گوڵەکانیت لێ دەسڵمێتەوە
هیچ باخچەیەک ئامادە نییە سەر فترەی عەتری خۆیت بداتێ وسەری ئارامی خۆی بە دیار چیرۆکی
/خورشیدو خاوەری تووە بهێنێتە ژان
تۆ کە لەبەردەم باخچەوە ڕەت دەبیت دەبێ زمانی دڕکیش بزانیت .. بە شەپۆل بڵێ هەڵچوونی -
ئاو مەعنای چییە ..!! پێت دەڵێن ژن لە پەراسووی ماسۆشییەتەوە درووست بووە
با) کە لە دوورەوە دەکۆخێ دارستان بە پەلە حەوشەی گەڵاکانی دەکاتەوەو) -
.. بە سێبەر دەڵێ بڕۆم مێردەکەم هاتۆتەوە
-: لافاو کە تووڕە دەبێت کەنار بە پێکەنینەوە دەکشێ و ئامێزی بۆ دەکاتەوەو دەڵێ
. پیاوەکە تۆ ئیمڕۆ لە هەموو ڕۆژەکانی تر جوانتریت -
مەهدی- تۆ سەهۆڵبەندانێکیت لە شەرم ، تەریق بوونەوەیەکی ڕۆمانسیت -
بەرگەی نیگای هیچ خۆرەتاوێکی گەرم ناگریت .. هەڵدێی بۆ قووڵایی سێبەر
.. بۆ لای کەنارە دوورەکانی تەنیایی و گلەیی بۆ بەرد هەڵدەڕێژیت
.. بمرە کە ئیتر مردنیش دادت نادات ..، بڕۆ بۆ ئەو پەڕی نەمان مەگەڕێوە چ دەکەی لێرە -
لەسەر ڕایەخی ئەم تەنیاییە چوار مشقی بۆ خۆت دانیشە تاکەی لە نێو خۆشخەیاڵیدا پاڵ دەکەویت ،
-: ئەو شەمەندەفەرە ڕۆیشت و بەسەر چوو کە سەردەمی ڕۆمانسییەتی هەڵدەگرت
ئەم دراوانەی عەقڵی تۆ زۆر کۆنن لەم مەملەکەتەدا قیمەت ناکەن .. ئەم فرمێسکە خەیاڵیانەی -
- گریانی بێ سوودی تۆ کلاسیکین / بیرەوەرییەکانی تۆ ئێستا باویان نەماوە هی زەمانی - قاجارییەکانن
بۆنی سمڵو مێخەکی ئەم عاتیفانەی تۆ قەدیمن هی سەردەمی - لویسی چواردەهەمە - و -
ئیتر ڕەواجیان نەماوە ، دڵی تۆ کێش و سەرەوای هەیە هی سەردەمی غەزەلەکانی - موتەنەبی - و
بازاڕی شیعری - عەرەبییە - تۆ بۆ مۆزەخانە باشیت (( سێ کەرەت تۆ ئەکاتە هیچ و)) = یەکسانە
/ بە ئایندە کە ناتهێنێتەو بۆ بەردەم قاپی ئەو بەیانییەی گوڵەکان جوانی لە خەو هەڵدەستێنن
تۆ هیچ شتێکت لە ئایندەدا وون نەکردووە حەقی ئەوەت نییە لە بەیانی بپرسیت بەهار کەی دێت ،
/ ئەو قسەیە جێبهێڵە بۆ کەنارییەک کە دڵی خۆشەو لەم دارستانەدا دەخوێنێت
بایەک کە سێبەری ڕۆشنایی ئاو دەدات / پەپوولەیەک کە شەوو ڕۆژ ئێشکی ڕەونەقی جوانی دەگرێت
تۆ خەریکی چیت بۆ ڕێ لەو ئاوە دەگریت کە لە ڕۆیشتنی خۆی ڕازییە ، قسەی ناو کتێبەکان بۆ من
مەکە ، تۆ دەکەویتە چەقی بازنەی گۆشەگیرییەکەوە کە بە بیرەوەری داخراوە / لە نێو لاکێشە
درێژەکانی نەریتی سادەی ژیاندا بەم گرێ کوێرە ئاڵۆزانەوە جێت نابێتەوە / جەمسەرە ناشرینەکانی
ئەلیف و بای- خوێنت زۆر ساردن / تۆ ڕاستە هێڵێکی پەککەوتەی هیچ ڕێکایەکی قەد بڕ ناتوانێت -
دەستت بگرێ و وەک خاڵی بەر کەوتن بتهێنێتەوە بۆ بەردەم دەروازەی حەرەم سەرای ژیان
تازە لۆغارتیمێکی ماتماتیک چیت لێ بکات سەر لە تیئۆرەکانی - فیزاغۆرسیش - تێک مەدە
تۆ لەبەردەم سەبووری هیچ بەیانییەکدا حەوسەڵەت نییە پەنجەرەی نەسیمێک بکەیتەوەو
گوێ لە هاتنی خشەی بایەک بگریت کە هەواڵی نێو چرۆی تەڕی دارستان و بۆنی پەڕی بە جێماوی
باڵندەیەکی تازە جووت بووی پێ بێ / تۆ هیچ تاقەتێکت نییە گوێ لە قاسپەی بەسۆزی سێبەر و بۆنی
هەناسەی پەمەیی نیوەڕۆیەکی عارەق کردووی گەرمای هاوین بگریت ئیتر لەم تاریکاییەدا شیعری
چی بۆ ڕۆشنایی دەخوێنیتەوە کە عەقڵی هیچ جوانییەک ئیستیعابی ناکات / پێت ناخۆش نەبێت
تۆ هەندەسەی بوونت لە بنەڕەتەوە هەڵەیەو من سەرم لە نهێنی ڕۆمانسییەتی گریانی تۆ دەرناچێت

من هەڵەیەکی زۆر کوشندە نیم لیسا گیان تەنها ووتومە مانگ لە گۆشەی جوانی تۆدا -
چوارەدەی داوەو منیش لە تاریکایی خۆمەوە خۆشم دەوێت ، حەز دەکەم شەوقی ڕۆشناییەک
دەعوەت بکەم بۆ ماڵەکەم و پێی بڵێم تاریکی لە ناخمدا لەسەر گازی پشت ڕاکشاوە
من تەرمی جەنازەیەکی ساردم لە بستێک خاکی میهرەبیانی خۆتدا لە پاین تەلیسمی شکۆفەی
جوانی خۆتەوە بمنێژە ، بێدەنگی منیش شایانی گێرانەوەی هەیە بۆ تریفەی مانگێکی بە ساڵاچوو
کە دەستنوێژ لە تاریکایی شەو دەگرێت ، حەز دەکەم بەیانییەک لابداتە لای پەنجەرەی خامۆشی من و
بڵێ مەهدی چۆنی .. بیرت دەکەم .. ئێستا ئیشم هەیە و دوایی دێمەوە سەرت لێ دەدەم ،
پێم خۆشە پێش ئەوەی بمرم تێم بگەی من پیاوێکی درۆزن نیم / لە قەراغ ئەم ئاوە ڕۆشنەی جوانیدا
ناشرین ڕانەوەستاوم / لەبەردەم حورمەتی ژیاندا بۆ گاڵتە پێ نەکەنیوم / من دارە مەیتی
بیرەوەرییەکی تاڵم کە لە ئاشووبی زەمانێکی زووەوە بە جێ ماوم لێرە لە نێو ئەشکەوتی چاخەکاندا
بە مەرگی خوا نە مردووم بە مەرگی تەنیایی مردووم ، مردنێک کە خاڵییە لە هەموو سەفایەکی ژیان
/پڕە لە حیکمەتی فەرامۆشی
.. دوا ئیعترافی گوناهەکانم ئەوەیە کە خۆشم دەوێیت
جوانی لیسا لە مەتحەفی لۆڤەردا پارەیەکی خەیاڵی دەکات -
منیش لە غەزەلێکی -سەعدیدا - گریانێکی بە کوڵ دایگرتووم خەڵکی وا تێدەگەن سەرەوای شیعرەکە -
.. عەقڵی نوقستانە
لیسا پێکەنینی بە عەقڵی ئەغریقی کۆنی من دێت کە ژێر بیرەوەرییەکانی خۆم هەڵدەدەمەوە -
بۆ ڕۆشناییەک دەگەڕێم کە خۆم نیمە .. هیچ بەیانییەکی تریش لە داهاتووی مندا نەیشاردۆتەوە
دەڵێ لەم کڵاوەیاندا نییە خۆت هیلاک مەکە ، لە بەیانیشدا نییە چونکە پشووی ڕۆژی حەفتەیەو -
. مێروولەیش دەوام ناکات .. لە دوو بەیانیشدا نییە فت .. لە هیچ بەیانییەکی تریشدا نییە هەر مەگەڕێ
بێرەوە دەستت دابکوتە بزانم خاتی یان شێری ماویت یان مردوویت -
من هیچ کامیان نیم لیسا خانم .. نەشیرم و نە خێرم ، من ئاوێکی بێ کەنارم لە نێو بۆشایی داڵغەی -
ڕۆیشتووی خۆما دانیشتووم تەنها لە جوانی بن باڵی تۆ سەرم سووڕ دەمێنێت کە بە سەوزەگیا
داپۆشراوە پێم وایە ئەگەر خواوەند تۆی دروست نەکردایە بەردێک لە دڵرەقی ژیان کەم دەبووەو
مردن هیچ مەعنایەکی نەدەما
لیسا پێکەنینی بە من دێت کە بە بەگا دەڕۆم بەرەو ئایندە .. کە پێدەکەنێت چەند جوانە -
مانگ لە نێو باغی هەناری لێوەکانییەوە بە ئەسپایی سەر دەر دێنێ و لەو دوورەوە ڕادەوەستێت
بەفری جەستەی کلوو کلوو دائەکاتە سەر داڵغەی ڕۆیشتووی من ، ( با) چەند بە حەیاوە لەبەر پێیدا
.. دەنوشتێتەوە .. ئاو چەند بەنەزاکەتەوە لەبەر دەمیا هەڵدەستێتە سەر پێیان
.. هیچ شتێک دەربارەی لیسا نازانم تەنها ئەدرەسی بێ وەفاییەکیم لایە -
لە مێژەوە لە گەڕەکی پاڕانەوەکانی منا باری کردووەو لەسەر شەقامی بێ دەنگییەکی بە ویقاری
.. بووزایی - دادەنیشێ -
بە پارکێکی دراوسێی جوانی لیسام گووت (( من کابرایەکی ڕۆژهەڵاتیم و ووڵاتەکەم لە شەڕە -
قووشیلانی ناوخۆیدا هەرتک چاوەکانی دەرهاتن و ئایندەم لە خەفەتان عەمری خوای کرد
هەتیووم ئەمن نەهاتووم بۆ ئەوەی بژیم تەنها هاتووم بۆ ئەوەی لەم تەنهاییەدا نەمرم بەشکو پێی
بڵێی :- خۆشم دەوێت .. گووتی بەیانییە هێشتان لەخەو هەڵنەستاوە بڕۆرەوە سەدەیەکی تر بێرەوە
.. جوابت لێ دەگێرمەوە
نازانم دەترسم تا من بگەڕێمەوە دوکانی ژیان دابخرێ و فریا نەکەوم دوو مەتر کفن بکڕم و -
.. ئەم بیرەوەرییانەی تیا بنێژم
من لە تاقی کردنەوەی سەری ساڵی خۆشەویستی لیسادا دەرنەچووم هەرچەندە لە شیعرەکانی -

نالی - دا زۆر سەعیم کردو لە تەنهاییشدا یەکەمم هێنا وەلێ تێنەگەیشتم هەڵەکانی ژیان لە کوێدایە -
لیسا کە ڕەفزی کردمەوە لە بەردەم ئاوێنە تەڵخەکانی ژیاندا دڵم لە خۆم داما بزانم کوێم ناشرینە -
!!.. غەزەلەکانی -سەعدی - عەیبیان چییە
.. بەڵام من بە ڕەفزەکانی لیساوە جوانم -
لیسا هەموو شەمەو یەکشەمەکانی لێ ستاندوومەتەوەو ئیدی ڕۆژەکانم لە یەکەوە ناکەم -
.. هەموویان هەر ناویان لیسایە
لیسا لەسەر هەموو لاپەڕە سپییەکانی داهاتووم بە خەتاتی نووسیوویەتی خۆشم ناوێی -
/بەڵام من گوێم لە قسەی ئەو نییەو هەر خۆشم دەوێت
سادییەتی خۆشەویستی لیسا پێم فێر بووە هەموو بەیانییەکم ووردو خاش بکا -
لە یەکەمین جەنگی جیهانی یەکەمەوە تا ئێستا داگیری کردووم و هەر پارچەیەکمی فڕێ داوەتە -
.. قوژبنێکی فەرامۆشی جوانی خۆیەوە ئیتر ئیدمان بوو بە داگیر کردنم
ماسۆشییەتی خۆشەویستی لیسا ئەوەندە -کەری - کردووم شانازی بە ڕەفزەکانییەوە بکەم -
) پێم وانییە هیچ پیاوێک لە دونیادا بە بارتەقای من خەتی ڕاست و چەپی x لیسای بەسەر دڵی خۆیەوە(
بینیبێ .. لە هەڕەتی مەلەکییەتمدا بوو لیسا بە پیاوی نەزانیم و ئاوی بەردایە شوێن هەواری وجاخی
گەنجێتیم و نەیهێشت ئاگرێکی نەورۆزی تیا بکەمەوە .. دواتر ڕاهات بە حەق و بە ناحەق لچم لێ
هەڵبقورتێنێ و لەسەر هەموو دەقە ڕەواکانی عیشقی من بنووسێت ئەم بابەتە بۆ بڵاو کردنەوە ناشێ
هەموو بەیانییەکیش نوێژی قایم بەر لەوەی خێرو شەری عیشق و میهرەبانی دابەش بکرێن
نامەیەکی ڕەفز بە خەتێکی جوان لەبەردەم دەرگا ترساوەکانی دڵی کڵۆمدراوی منا جێبهێڵێ
لیسا پۆستە چییەکانیشی پێ فێر کردووم هەر هەواڵێک لە چارەنووسی نادیاری منەوە دەهێنن
.. هەر لە دوورەوە بانگم دەکەن ڕەفزێکی نوێت بۆ هاتووە
.. من هەرگیز لیسام نەبینیووە تەنها بە دالغە دەیناسم -
لە حەدیسێکی - سەحیحی بوخاریدا - دەگێڕنەوە دەڵێن لە سەردەمی خەلافەتی گەمژەیی مندا -
لیسا گۆبەنێکی گەورەی لە نێوان قوڕەیشییەکانی عەقڵی نوقستانی من و کچێنی کافرۆشی ))
خۆی و عادەتی لادێی وەرزەکان و ساڵە بەدووەکانی بیابان نشینی دووهەزارو
(( !! .. ڕۆژە سوورمەییەکانی خۆشەویستیدا ناوەتەوە
لە نزیک عەقڵی خەرەفاوی منەوە دەگێڕنەوە یەکشەمەیەکی دراوسێم هەیە وەختێک -
.. دڵی چوو لە لیسا تەرکی ڕۆژەکانی حەفتەی کردو لە بارەکانی بەدمەستیدا لێی کەوتووە
شەمە بەیانیان خەبەری نابێتەوەو فریای یەکەمین ڕۆژی حەفتە ناکەوێت بە بیانووی ئەوەی -
.. کە دوێنێ شەو لە بارە خۆشخەیاڵییەکانی لیسادا زۆری خواردۆتەوەو هێشتان بەری نەداوە
دووشەمەیەک لە عەشقی جوانی لیسادا عەقڵی تێک چووەو لە شێتخانەی خێر خوازی -
.. چاوە شینەکانی لیسادا لە ڕێی خوا بە خێوی دەکەن
بەزەییم بە عەقڵی سێ شەمەیەکی نەگبەتدا دێتەوە کە بۆ خۆی ناشێ ، هەر پارەو پولێکی پەیدا -
دەکات لە قوومار خانە بەرزەکانی باڵای لیسادا گرەو لەسەر بەختی ڕەشی خۆی دەکات و
.. هەموو جارێکیش دەیدۆڕێنێت
چوارشەمەیەکی تاقانە لە هەڕەتی گەنجێتیدا بوو کە لیسا ڕەفزی کردەوە بەرگەی نەگرت و -
... ئینتیحاری کرد
پێنج شەمەیش فێر بووە بە ڕێک و پێکی لەگەڵ ڕۆژەکانی حەفتەدا نایەت ، جارێک بە بیانووی -
ئەوەی سەری ژان دەکاو جارێک دەڵێ تووشی فەقەرات هاتووم بەڵام درۆ دەکات هەموو شەوێک
.. بە لیساوە شەیتانی دەبێت
ڕۆژەکانی هەینی کە لیسایان بینی عەمەلیان شەڕ بوو لە نوێژی جەماعەت تەبەڕا بوون و -

خوویان دایە هەتیو بازی
فەسڵی هاوین کە جەستەی لیسای بەڕووتی بینی دەیری بوو خووی دایە هیرۆئین و -
.. وازی لە برادەرایەتی وەرزەکانی ساڵیش هێنا
لیسا شەوانە لەگەڵ مندا پیاسە دەکات هەرچەندە مانگ جگەرەی تەرک کردووە -
بەڵام کە لیسا دەبینێ خەفەت دایدەگرێ ودەست دەکاتەوە بە جگەرە کێشان .. بەرەبەیانیش
. کە ئیزنی لێ دەخوازێت ئەستێرەکان سەریان لێ تێک دەچێ و لەگەڵ لیسادا دێنەوە بۆ ماڵ
.. من هەرگیز لیسا ناناسم تەنها لەخەوما بینیوومە -
ئەو ڕۆژەی کیمیا باران کرام ...لیسا لەبەردەم ئاوێنەکەیدا پەست بوو -
.. لەبەر ئەوەی قژە جوانەکەی بەهیچ لایەکدا نەئەوەستا
بۆ ڕۆژی دوایی دڵم ئەنفال کرا ... لیسا لە نێو هەڵمی شامپۆی حەمامەکەیدا -
.. داڵغەی ئەو کوڕە درێژە دایگرتبوو کە باوکی بازرگانی بێدەنگی بوو بەڵام خۆی زۆر چەنباز بوو
سێیەمین ڕۆژ لە کۆڕەوە ناسکەکەی تەمەنمدا ... لیسا هەر لەبەردەم ئاوێنەکەیدا بوو -
.. بەڵام بەکوڵ دەگریا لەبەر ئەوەی بەیانی لەبیری چوو بوو بەرچایی بداتە سەگە خنجیلانەکەی
دوای ئەوەی لە شەڕە گەرمەکانی ناوخۆییدا چەند جارێک دیل بەدیل کرام -
لیسا لەبەردەم ئاوێنەکەدا تەواو خۆی پۆشتە کردو لەگەڵ ئەو کوڕە درێژەدا ڕۆیشتن بۆ دانس
من لە نێو زەردەپەڕی تەنیایی خۆمدا بە بێ دەنگی تەماشای ئێوارەم دەکرد -
.. کە لە پشتی گردەکەوە ئاوا دەبوو
.. تارمایی لیسا لە دوورەوە دەستی هەڵتەکاندو گووتی من لە چارەنووسی تۆدا هەڵنایەم -
بێ ئومێدی لە ناخمدا لەسەر دەم خۆی دا بە عەرزاو لە دراوسێتی ژیان بارم کرد ، قفڵی تەنهاییم -
لە خۆم داو ڕۆیشتم بەرەو بێدەنگییەکی دوور ... دوور لە مەملەکەتی ئەو دڵانەی
.کە لە مەعنای شکان تێناگەن
هەموو ڕۆژەکانی حەفتە و مانگ و وەرزەکانی ساڵ و سەدەکانیش و منیش لەبەردەم جوانی لیسادا -
.. زەلیل بووین ، هەموو کەسێکی تریش ئیحتیاجی بە جوانی لیسا دەکەوێت
.. (( هەموو ساڵێک سێ مانگەو وەرزی بەهار دێت جلە سەوزەکانی لیسا بە (( ئیستیعارە دەخوازێ -
.. ئاسمان کە شینایی لێ دەبڕێت لە چاوەکانی لیسا قەرز دەکات و دوایش نییەتی بیداتەوە -
خۆرەتاو کە ڕەنگی زەردی ئاڵتوونی پێ نامێنێ دێت لەگەردنی لیسا دەپاڕێتەوە -
یەک کەم ڕەونەقی بداتێ .. لیساش بەنازەوە دەڵێ ئێ ئەو حەفتەکە دامیتێ خۆ هەموو ڕۆژێک
(( خان نییەو (( من دوکانم دانەناوە
هەر ڕۆژێک لیسا نەخۆش بێت لێرە خۆرەتاو هەڵنایەت ، هەموو دونیا تەم دایدەگرێ و -
ڕۆژەکانی حەفتەیش دەرناچن لەماڵ هەرچی سەرمای دونیا هەیە لە نێو کۆڵانە سەختەکانی
.. هاژەی باو لێزمەی بەخوڕی باراندا شەو تا بەیانی ئێشکی جوانی لیسا دەگرن
هەر عانێک لیسا بێ تاقەت بێت لێرە خۆر گیران دەست پێ دەکات و (ئاو) ڕادەوەستێ و -
.. با) بە هیچ لایەکدا ناڕواو قەترە بارانیش ناباریّ و ئیتر ئاو لە ئاشی ژیان ناگەڕێ)
هەر کاتێک لیسا بگری ئەوە نیشانەی ئاخر زەمانە .. ئیتر خوا غەزەب لە هەموو دونیا دەگرێت و -
یەکسەر خۆر ئاوا ئەبێت و ئاسمان شین و زاری دەکات ، ڕەشەبایەکی قایم لەوسەری دونیاوە
.. هەڵدەکاو دەبێ بە تاریکە سەڵات و چاو چاو نابینێ و ئاخری زەمان دەست پێ دەکات
((.. قەشەکانی کەنیسە لە ترسانا لە - مەسیح - دەپاڕێنەوە (( خودایە با لیسا نەگری -
. ((.. بۆ ئەوەی ئاخری زەمان بێت شەوو ڕۆژ لە - مەسیح - دەپاڕێمەوە (( خودایە با لیسا بگری -

